وەرگێڕ لە فارسیەوە : قازی ئەحمەد

# مناجات

## ٢

ناوت دەستێکە چەتری بەسەر ئەبەدییەت دا ئەنکاوتووە
ناوت بورجێکە لە سەرووی قوربانگای ئیخلاسەوە
ناوت دەستێکە کە بە سەر نیو چاوانی ویستن دادەکشێ
ناوت دەستێکە کە رووحی توانین مەسح دەکا
لق بە بەرەکەتی ناوت چرۆ دەکا
دەریا بە موبارەکی ناوت دەهاژێ
مردوو بە بەرەکەتی ناوت زیندوو دەبێتەوە
ناوت دادانی هەر بوونی واتا دەقاپێلکی وشەدایە .

* * *

ئیبلیس چاو دەباتە بانگ هێشتنی ئیرەیی*
کوێ دەکاتە میوانی جاسووسی
و زبان دەباتە جێژنی تۆمەت و بوختان
و دەست دەبانە زیافەتی بەغیلی
پێ دەباتە میوانی کەللە رەقی
ئیبلیس دڵ دەباتە بانگ هێشتنی بێ خەبەری
گیان دەباتە میوانی ناهومێدی
ئیبلیس هەموان دەباتە هەوا و بەزمی دۆزەخ
مەگەر ئەوانەی بلێ* تۆ کەسیان نەدیت
مەگەر ئەوانەی بلی ناوت هیچیان نەبیست

* * *

خودا چاو دەباتە زیافەتی دەرس وەرگرتن
کوێ دەباتە میوانی شحەت و ئەندەرز
زبان دەباتە بەزمی ئیقرار بە گەورەیی خوی
دەست دەباتە زیافەتی بەخشین
پێ دەباتە بەزمی مل نەدان و چەقین
خودا دڵ دەباتە بانگ هێشتنی خۆی
گیان دەباتە بەزمی فریشتەکان
خوداهەموان دەباتە بەزم و بانگ هێشتنی بەهەشت
مەگەر ئەوانەی رووبان لە راستی وەرگێڕا تا خوار و خێچەکە ببینن
مەگەر ئەوانەی رووبان لە پاکی وەرگێڕا تا ناپاکی هەڵبژێرن

* * *

خاوەن ئیمانان لە دنیا تێ پەڕین
لە بەرزەخ تێ پەڕین
لە دۆزەخ تێ پەڕین
لە ... تێ پەڕین
لە ماکەی هەبوونی خۆیان تێ پەڕین
لە سەر تەختی تەحیەت ڕۆنیشتن

* * *

شەڕوڕەکان ئەفسانەیان هۆندەوە
وەك جاڵجاڵۆوکە خانووچکەیان تەنی
روویان لە راستی وەرگێڕا
بە سواری کە حێلی بە کۆڕژنی هەوەس
تا جەهننەم بە تەقڵە کوت ڕۆین
لە ماکەی هەبوونی خۆیان هەڵاتن
لە سەر تەختی سزادیتن ڕۆنیشتن .

قاسم موئەید زادە
( هەڵۆ )

# نێوەرۆک

آدرس : مرکز نشر فرهنگ و ادبیات کردی

"انتشارات صلاح‌الدین ایوبی"

ارومیه : صندوق پستی ٧١٧


لەخشێنەری روو بەرگ : کاک جەعفەر قازی

وێنەی پشتی بەرگ : عوسمان باژیان لە سەقز

## سەروتار

### ٤ نوێنەرایەتی مەجلس

دەژمارەی رابردوودا کە باسی هەڵسووڕانی فەرهەنگی و هەڵوێستە سیاسی‌یەکانمان دەکرد، بەو ئاکامە گەیشتین کە کاروباری فەرهەنگی نابێ بخرێتە نێو چوارچێوە و هەڵوێستی سیاسی و رامان لە سەر ئەوەدا کە چوارچێوە و قالبی سیاسی (بە واتای ئاسایی ) بۆ هەڵسووڕانی فەرهەنگی چوار چێوەیەکی تەنگ و بەرتەسکە و زیانی زۆری بە دواوەیە . چونکە سیاسەت ، ئەویش سیاسەتی رۆژ چوارچێوە و شوێن و رێبازی دیاریکراوی نیە و نازانین هەڵسووڕانی فەرهەنگی دەبێ هاوهەنگاوی کام رێباز بێ ؟

دەم ژمارە دا دیسان بەشێکی دیکە لە باسی " پێوەندی فەرهەنگ و سیاسەت " بە بیانووی نوێنەرایەتی مەجلیس دەخەینە ژێر لێکۆڵینەوە . بەلام ئەم وتارە سەرەتایی یە زۆری کێشا و هێشتا نەمانتوانیوە باسی "نوێنەرایەتی مەجلیس " بکەین . چونکە باس کێشایە سەر پێوەندی " فەرهەنگ و سیاسەت " و ئەگەر بمانەوێ ئەو باسە بە تەواوی بنووسین ، مەسنەوی دەبێتە حەفتا مەن * چونکە ئەنجامدانی کارێکی وەها ،

پێداویستی بە باسی بەر بڵاو لە روانگەی فەرهەنگ و هونەر و مەکتەبە سیاسی یەکان و زۆر شتی دیکە وە هەیە و ئەوەش بە دەیان وتار و مەقالە جێ بە جێ ناکری ٠ هەر بەو هۆیەوە تێکۆشاوین کورت و موختەسەر بەسەر ئەو باسەدا تێپەڕین تا هەم باسی بابەتەکەمان کردبێ و هەم دەرفەتی ئاکام وەرگرتن لە قسەکانمان لە دەست نەچێ و خوێنەری کەم حەوسەلە ـ کە رەنگە ژمارەشیان کەم نەبێ ـ لێمان تووڕە نەبن ٠ ئەوەش بگوترێ باشە کە ئەو باسە لەوە کورتتر نەدەکراوە چون لەوانە بوو ئەگەر کورت تری بېڕینەوە تێمان نەگەن.

لە لایەکی دیکەشەوە زەق کردنەوەی باسێکی وەک " نوێنەرایەتی مەجلیس" داوخوازی ئەو سەرەتایە بوو ٠ خوێنەرانی خۆشەویست کە چاوەڕوانی " باس دەوبەستێنەد ان بێگومان زانیویانە کە ئێمە نامانەوی هێندێک بابەتی دووپاتە کراو کاوێژ کەینەوە و باسی ئەرکی نوێنەران بکەین ٠ ئەڵبەتە باسی هێندێک لە ئەرکەکانی نوێنەران دێتە ئاراوە بەڵام نەک باسی رێگاوبان و نان و ئاو و شتی وا بەڵکوو باسی بەشداری کارامەی ئەوان دەپێک هێنانی داهاتووی رووناک دا دەکەین ٠ ئاشکراتر بڵێین ئامانجی ئێمە روون کردنە ـ وەی پێگە و پلە و پایەی نوێنەرایەتی و نوێنەر دەمەجلیس دایە نەک ئەرکە ئاسایی یەکانی نوێنەر ٠ لەم روانگەوە قسە سەرەتایی یەکانی ئێمە ئەگەر چی بە رواڵەت رەنگی پێش وتاری هەیە بەڵام دە راستیدا بۆنی ئامانجی بنەرەتی ئێمەی لێوە دێ و کاکلەی باسەکەی تێدایە ٠ کە وا بوو ئەم سەرەتایە نابێ لە باسی دەبەرچاوگیراو بە جیاواز بزانین ٠ دەو حاڵ و هەل و مەرجەدا پرسیارێک دەمێنێتەوە ، ئەویش ئەوەیە ئەگەر باسەکە بەم هەراوی یە هاتوتە گۆڕێ ئەدی بۆ. چی سەر دێڕێکی باشتری بۆ هەڵنەبژێراوە ؟ دێرەدا روون کردنەوەیەک پێویستە ٠هەڵبژاردنی سەر دێڕی " نوێنەرایەتی مەجلیس " بۆ ئەم باسە تەنیا تەئکید و سوور بوون لەسەر گرینگایەتی ئەم پێگەو پایەیە دە درێژە دان بە باسەکەدا ٠ لە بەر ئەوە هاتینە سەر ئەم بڕوایە کە هەڵبژاردنی ئەم سەر دێڕە ورووژ کردنی ئەم سەرەتایە دەتوانێ واتا و ناوەڕۆک بە شکڵێکی مناسب بباتە نێو زەینی خوێنەر ٠

لەم باسە دەگەڕێین و باسەکە بە بەیان کردنی مەتڵەبێکی گرینگ کە سەرنج دانێکی بە وردی پێدەوێ درێژە پێ دەدەین ٠ پێشەکی گوتمان نابێ فەرهەنگ دە ژێر چاوەدێری سیاسەت دابێ ٠ ئێستا گریمان* توانیمان دەژێر هەل و مەرجی تایبەتیدا ئەو چاوەدێری یە قەبووڵ بکەین ٠ ئەو جار دەبێ ئەو پرسیارە وەڵام دەینەوە کە ئەم هەل و مەرجە کامەیە ؟

جواب دانەوەی ئەم پرسیارە هەل و دەرفەتی زۆر تری دەوێ و کەمێک لە باسەکەمان دوور دەخاتەوە ٠ تەنیا بۆ ئەوەند*وکە پێداویستی یەی کە بۆ باسەکە پێویستە ئاشێرەی پێدەکەین ٠ئەمڕۆ گرینگترین مەسەلەی فەرهەنگی ، بووژاندنەوەی زبان و ئەدەبی ئێمەیە ٠ ئەو زبان و ئەدەبەی کە دە زەمانی دەسەڵاتداری ستەمکارانەی تاغووتدا دە زنجیری بەر چاو تەنگی رەگەز پەرستانە دا بە دیلی مابۆوە و نەیدەتوانی نەفەس بکێشی و بە خۆیدا بێ و یاڵ و قژ بێنێتەوە و دە هەوا ژەهراوی یەی ئەو سەردەمەدا خەریک بوو دەبنەڕتدا ببە تلێ و ئەو دارە بە بەروبوویە لە رەگ وریشە هەڵکەندرێ و لە ناو بچێ ٠ دە هەوای ئالوودەی ئەو سەردەمەدا هەر جووڵانەوەیەکی فەرهەنگی بتویستبا و نەتویستبا ـ بە سیاسەت دەزاندرا ٠ سیاسەتی فەرهەنگ ئەستڕینەوەی حکوومەتی شا کە دە قالبی رەنگاو رەنگدا بە قازانجی سیاسەتی ئیستیعماری دەکرا تا فەرهەنگی سەرلێشێواوی رۆژاوا دە جیهانی سێهەمدا پەرە پێ بدەن ، بۆ خاشە بڕ کردنی فەرهەنگی ئێمە بەرێوە دەچوو ٠ ئامانجی ئەو سیاسەتە سەرکووت کردنی بیرو باوەڕی رووناکبیرانە و لابردنی سەر بە خۆیی فەرهەنگی بوو ٠ ئەم خەیانەتە گەورەیە هەر وەک خۆی لە ئامانجی ئیستیعماری، کە فەرهەنگ دەخزمەت سیاسەتدا دەکار دێنێ ، سەر چاوەی دەگرت ، لەو لاوە دەبوەهۆی کۆ بوونەوەی هەموو چەشنە جووڵانەوەیەکی ساغ

و مرۆڤانه و یەزدانی ده چوار چێوەی سیاسەتی دژایەتی دەگەڵ خودی ئەم سیاسەتەدا که شا به رێوەی دەبرد . له بەر ئەوه دەبوایه فەرهەنگی نەتەوایەتی ـ ئاینی که زامنی ئازادی و سەر به خۆیی ، گەشەی فەرهەنگی ، ئابووری ، زانستی ، هونەری و زۆر شتی دیکەش بوو له ناو بچێ . ده هەل و مەرجی ئاوا دا هەر کارێکی فەرهەنگی هەڵوێست گرتنێکی سیاسی بوو . ئەم رەوەنده تاڵه زەرەر و زیانێکی زۆری له زبان و ئەدەبی کوردی دا . مەترسی ئەدەبیاتی ناوچەیی بۆ هەرەشه له هیمنایەتی نەتەوه یی، تەواوەتی ئەرزی و سەر به خۆیی وڵات ، چۆماغێك بوون بۆ سەرکوت کردنی جووڵانەوەی فەرهەنگی و ئەدەبی . زورناکانی شا له هێندێك ماموستای زانسگەوه تا رۆژنامه نووسه بازرگانەکان بێ برانەوه ئەو تەبلیغاتەیان کاوێژ دەکردەوه و کۆمەڵیان فریو دەدا . پێ یان وابوو بۆ گەیشتن به شارستانەتی گەوره (تمدن بزرگ) تەنیا دەبێ هانا بۆ قەبری کوورش و تەختی جەمشید و شنێلی داریووش بەرن . ئێمه له جێگای خۆیدا باسی ئەدەبیاتی گەلەکانی ئێران دەکەین و پله و پایەی ئەوان روون دەکەینەوه .
د یره دا مەبەستمان له و باسه تەنیا روون کردنەوەی هەل و مەرجی ئەو سەر دەم بوو . مەبەست ئەوەیه ئەگەر بڕوا مان بێ کار و باری فەرهەنگی ده هێندێك بڕگه و هەل و مەرجی تاریخی دا رەنگ و بۆنی سیاسی یان لێوه دێ، دەبێ بزانین ئێستا ده چ هەل و مەرجێکدا دەژین و حاڵ و هەوا چیه ؟

گومان دەوەدا نییه که سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی ئێران ئاڵ و گۆڕێکی بنەڕەتی پێك هێنا . ئەم ئاڵ و گۆڕه دەبەستێنی فەرهەنگ و هونەریشدا بوو به هۆی له دایك بوونی گەلێك روودا و یا مەسەلەی تازه که قانوونی ئەساسی چوار چێوه و شکڵ و سنووری تایبەتی بۆ ده بەر چا و گرتووه . به پێی ئەم قانوونه جووڵانەوەی فەرهەنگی به زبانەکانی دیکەش ئازاده و تەنانەت دەرس گوتنەوەی زبان و ئەدەبی ئەو گەلانه شان به شانی زبانی فارسی که زبانی رەسمی یه ، کارێکی قانوونی و ئازاده .

ئێستا که بنەڕەتی ترین هەڵسووڕان و جووڵانەوەی فەرهەنگی به تایبەتی ئەوەی پێوەندی به زبانی کوردی یەوه هەیه ـ ده عورفی سیاسەتی رۆژدا خاوەنی پایه و و بنەمای قانوونی یه و بەرگری لێ ناکرێ ، بۆ دەبێ به زۆر ئەم جووڵانەوه رەوایه بەره و سیاسی بوون پاڵه پەستۆ بدەین ؟ له کاتێکدا دەتوانین بێ ترس و نیگەرانی و به هیوا و هومێدەوه زبان و ئەدەبی خۆمان ببوژێنینەوه، چ پێویستی یەك هەیه که ئەم هەڵسووڕانه بخەینه سەر دەندەی سیاسەت و ئەم کاره به قازانجی کێ یه ؟ ئێمه شاگردەکانی ماموستا هێمن له ژێر چاوەدێری ورد و بێ پسانەوەی ئەو دا ئەم ناوەندمان پێك هێنا و دیتمان که بەرهەمی لێکۆڵینەوه و بۆ چوونمان تەواو و کەماڵ دروسته و دەگەڵ راستەقینه جووتن . زیندوو کردنەو و پەره پێدانی زبان و ئەدەبی ئێمه له روانگەی قانوونەوه کارێکی رەوا بوو . هەموو ئەوەیان دەزانی بەڵام هیچ تێکۆشانێکی به راستی دەو پێوەندی یه دا نەدەکرا . شك و گومانێکی ئاڵۆز له بنەو ه پێشی به هەموو هەنگاو نانێك دەگرت . کاری ماموستا هێمن رامالینی ئەم شك و گومانه بوو . ئەو نیشانی دا که نه تەنیا ئارەزووی مێژوویی گەلی ئێمه دەتوانێ وەدی بێ ـ بەڵکوو به ئاشکرا رایگەیاند که کەلك وەرنەگرتن له هەلی رەخساو که میوه و بەروبەرهەمی شیرینی شۆرشه،خەیانەت و ناشوکری یەکی گەورەیه . ناوەند دامەزرا، سروه بڵاو بۆوه ، گەلی ئێمه به تایبەتی ئەدەبدۆستان باوەشیان بۆ ئەم کاره کردەوه ، لەو لا شەوه زۆر که س له بەر پرسانی وڵات بۆیان روو ن بۆوه که ئەم کاره گەلێك به قازانجه و سوودی زۆره . له ئاکامدا شك و گومان له هەر دووك لا وەلاچوو و تەفاهومێك که بنەمای قانوونی و دینی هەبووپێك هات . ده هەل و مەرجێکی ئاوادا دژوار کردن و رەنگدار کردنی کاروبار نه تەنیا گیر و گرفتێك لا نابا بەڵکوو دەتوانێ گیر و گرفتیش پێك بێنی و دەبڕگەی حەساسی ئەمڕۆدا وێرای کز کردنی کاروباری فەرهەنگی و ئەدەبی، ئەم

جووڵانەوەیە بە یەکجاری ئەستێور بکا و پێشی پێبگرێ .

سرمقاله

## ۴ نمایندگی درمجلس

در شماره‌ء گذشته در بحث ارتباط بین اقدامات فرهنگی و موضعگیریهای سیاسی ، در باب اینکه کار فرهنگی نباید به مواضع و یا قالبهای سیاسی مقید باشد ، بررسی مختصری بعمل آمد و نتیجه گرفتیم که قید سیاسی ( بمفهوم معمولی آن ) برای اقدامات فرهنگی ، ناصحیح و غیر اصولی است و یادآور شدیم که در صورت پذیرش چنین قیدی با مشکل دیگری مواجه خواهیم بود و آن مشکل اینست که سیاست روز به یك قالب و یك دیدگاه منحصر نیست و این امر که اقدامات فرهنگی را با کدام مشی سیاسی منطبق کنیم روشن نیست . در این شماره بخش دیگری از بحث " روابط متقابل سیاست و فرهنگ " را که بهانه نقد و بررسی مسئله " نمایندگی در مجلس" عنوان گردیده است ، مطرح میکنیم . اما از آنجا که این مقدمه بطول انجامیده و هنوز به طرح موضوع نمایندگی نرسیده‌ایم ،لازم دیدیم تا در اینمورد مطالبی را به استحضار خوانندگان محترم برسانیم . قبل از طرح موضوع فرهنگ و سیاست یادآور شدیم که این مختصرترین شکل ممکن است و گرنه تشریح مفصل روابط فرهنگ و سیاست و اجزاء سیاسی و فرهنگی و تاءثیر و تاءثرات متقابل آنها ، به واقع مثنوی هفتاد من کاغذ شود . چه انجام چنین کاری مستلزم مقدماتی مفصل در باب تعاریف و اصطلاحات ، به بحث در تاریخچه و تجارب جهانی ، دید گاههای فرهنگی ، سبك های هنری و مکاتب سیاسی و خلاصه به مقالات تفصیلی - تحت دهها عنوان - نیاز دارد که شاید نه ما را اهلیت آنست و نه سر مقاله را جایی برای آن . ما از آن مفصل به این مختصر بسنده کردیم تا هم به موضوع پرداخته باشیم و هم فرصت نتیجه گیری را از دست ندهیم که بدینترتیب خوانندگان کم حوصله را - که ممکن است تعدادشان کم هم نباشد - بی حوصله نکنیم . و البته کمتر از این نیز روا نبوده چه ممکن بود به ابهام بینجامد . از سوی دیگر اهمیت بحث " نمایندگی در مجلس" به همین مقدمه مربوط است و از اینرو خوانندگان محترمی که منتظر بحث ما در این زمینه‌اند مسلما " حدث زده‌اند که ما در این مقوله قصد طرح بعضی مسائل تکراری - در باب وظایف نمایندگان - را نداریم . ما البته به وظایف نمایندگان محترم اشاره خواهیم داشت لکن این اشاره نه از موضع تذکره نسبت به امور و مشکلات معمولی نظیر آب و جادّه و ... بلکه از باب مشارکت موءثر در روشن کردن افق آینده‌ء جامعه خواهد بود . واضحتر بگوئیم که هدف ما تبیین جایگاه نمایندگی و نماینده‌ء مردم ما در مجلس است نه فهرست کردن وظایف معمولی هر نماینده . از این نظر حرفهای مقدماتی ما - اگر چه ظاهرا " مقدمه‌ای بیش نیست - اما در حقیقت - چنانچه بخوبی دریافت گردد - هدف نهایی بحث را تاءمین کرده و جان کلام را با خود دارد . لذا نباید آن را مقدمه‌ای منفصل دانست در چنین حالی یك سئوال باقی می‌ماند و آن اینکه اگر بحث با این کلّیت مطرح و دنبال میگردد چرا عنوان مناسبتر که ناظر بر این کلّیت باشد انتخاب نشد ؟ در این خصوص این توضیح لازم است که انتخاب عنوان " نمایندگی در مجلس " برای این بحث صرفا " تاءکیدی بر اهمّیت این جایگاه در تعقیب اهداف بحث است و از آنجا که در ادامه پس از تشریح ابعاد موضوع - که در نوع خود از اساسی ترین مطالبی است که خواه ناخواه باید درباره‌ء آنها بحث می‌شد - این تاءکید همواره بوده است - لذا به نظر رسید انتخاب این عنوان و طرح این مقدمه بتواند مفاهیم را به شکلی مناسب منتقل سازد. از این موضوع می‌گذریم و بحث خود را با

بیان مطلب مهمی که توجه جدّی می‌طلبد دنبال می‌کنیم • اکنون از آنچه در رد تابعیت فرهنگ از سیاست گفتیم ، صرف نظر کرده و با فرض اینکه بتوان تحت شرایطی این تابعیت را پذیرفت • وظیفهٔ فرهنگی خودرا یکبار دیگر واز زاویهٔ جداگانه‌ای مورد بررسی قرار می‌دهیم • خوب فرض کرده‌ایم بتوان تحت شرایطی به اقامات فرهنگی رنگ و بوی سیاسی داد • در این حال لاجرم به این سئوال باید پاسخ داده شود که این شرایط کدام است ؟ پاسخ به این سئوال مستلزم فرصت و مجال بیشتری است و کمی ما را ازبحث دور می‌سازد • بدین خاطر از ورود تفصیلی به آن خودداری نموده و به قدری که در ارزیابی سطحی خود بدان نیازمندیم اکتفا می‌کنیم • امروز مهمترین مسئله فرهنگی ما اصل احیای زبان و ادبیات ماست • زبان و ادبیاتی که در زمان حاکمیت طاغوت ستم پیشه در بند تنگ نظریهای نژادپرستانه اسیر بوده و فرصت تجلّی و شکوفائی نیافته و در آن فضای مسموم می رفت تا برای همیشه در یك استحالهٔ تحمیلی از عمق جان جامعه کنده شود • در آن فضای آلوده یقینا " هر نوع تلاش فرهنگی - خواسته یا ناخواسته - یك جهت گیری سیاسی محسوب می‌شد • سیاست فرهنگ زدایی حکومت شاه که در پوششهای ظاهر فریب متعدد و در راستای سیاستهای استعماری - بمنظور صدور ابتذال فرهنگ غرب بجهان سوم و کشورهای در حال توسعه - اعمال می‌شد ، عمیقا " حذف اندیشه‌های روشن بینانه در " استقلال فرهنگی " را تعقیب می‌کرد • این خیانت بزرگ همچنانکه خود از هدف استعمارگرانه " فرهنگ در خدمت سیاست " ناشی می‌شد ، همهٔ تلاشهای فرهنگی متضّمن تهییج - عناصر انسانی - الهی و سالم رادر قالب سیاستی متقابل قرار می‌داد • و از این رو فرهنگهای ملی - مذهبی ضامن آزادی - استقلال ، شکوفایی فرهنگی ، اقتصادی ، علمی ، هنری و ••• باید محو و نابود می‌شدند • در چنین شرایطی کوچکترین اقدام فرهنگی - حتی بدون کمترین منظور سیاسی - یك موضع گیری جدی سیاسی تلقی میشد • در این ماجرای تلخ ، زبان و ادبیات کردی خسارت زیادی را متحمل گردید • بهانه قرار گرفتن خطر ادبیات محلی در تهدید امنیت ملّی ، تمامیت ارضی ، استقلال کشور و ••• چماقی بود تا بواسطه آن هر گونه تلاش فرهنگی در قالب هر گونه ادبیات محلی بشدّت سرکوب کردد • بلندگوهای شاه از بعضی اساتید دانشگاه گرفته تا مطبوعات چپان تاجر پیشه ، پیوسته با تبلیغ بر این موضوع ، سعی می‌کردند به اغفال جامعه بپردازند • گویی تمدّن بزرگ را راهی جز تمسك به قبر کورش و تخت جمشید و قبای داریوش و ••• نیست • ماالبته در جای خود و بطور مستقل همین مطلب ، که جایگاه ادبیات قومی و ملی و محلی کجاست ؟ بعنوان یك بحث اولیه ، در مورد مفاهیم قوم ، ملت و امت نیز بحث خواهیم کرد • منظورمان از این فراز آن بود که کمی در کیفیت شرایط سخن گفته باشیم • موضوع اینست که اگر قائل باشیم مسائل فرهنگی در بعضی مقاطع وشرایط شکل سیاسی پیدا می‌کنند ، باید دید که مقتضای شرایط حاضر کدام است ؟ تردیدی نیست که با پیروزی انقلاب شکوهمند اسلامی ایران و واژگونی تخت ظلم وجور ، شرایط سیاسی ، فرهنگی و ••• بطور بنیادی دستخوش تحول و دگرگونی گردید • این دگرگونی ، در عرصهٔ ادبیات و فرهنگ و هنر نیز باتولد بسیاری از مسائل جدید همراه شد که تصویب قانون اساسی ضمن تعیین چهار چوبها و محدودهٔ قانونی برای اقدامات فرهنگی ، شاخصهای آن را تصویب کرد • بر اساس این قانون دیگر فعالیتهای فرهنگی - ادبی به زبانهای مختلف مجاز شناخته شده است و حتی تدریس زبان و ادب ما در مدارس در کنار زبان فارسی - بعنوان زبان رسمی کشور - امری قانونی به حساب آمده است • اکنون که اصلی ترین اقدامات فرهنگی - بویژه مسائل مربوط به زبان کردی - در عرف

بروانه لاپه‌ره‌ی ۴۵

# بەسەرهاتی پێغەمبەران لەروانگەی عیرفانیەوە

■ عەلی ئەکبەر خازە

یست سالْ لە مە وبەر هات وچۆی مزگەوتێکم دەکرد٠ پیاوێکی لێ بوو کە هەم بەرنوێژی خەڵکەکەی دەکرد هەم سەر ئاڵقەی هەندێ لە لایەنگرانی ئەهلی سیرەت و سلووك بوو کە بۆ زیکروفیکری خودای مەزن خڕدەبوونەوە٠ ئەو پیاوە لە کاتی قورئان خویندنەدا حالێ دەگۆڕا و جاروبار دەگریا وجاروبارەش زۆرخۆشحالْ وکەیف خۆش بوو٠ کاتێك دەگەیشتە ئەو ئایەتانەی کەوا باسی قین و سەرزەنشت وسزادانی تێدابوایە دەستی دەکرد بە گریان وفرمێسك هەڵوەراندنێکی بە سۆزو لە ناخی دەروونەوە٠ کاتێکیش دەئایەتەکاندا باسی بەخشین وروحم ولێ بووردن دەکرا روخساری وەك گوڵاڵەی ژێرخۆرە تاو تروسکەی دەداو دە بریقاوە٠

ئەو حالْ وەهوایە ئێمەی تووشی سەرسوڕمان کردبوو جارێك لێی پاڕاینەوە هۆی ئەو ئالْ وگۆڕەمان پێ بلێ لەوەلامدا گوتی :

" بوکلۆلی وچارەڕەشی خۆم دەگریم٠ لەوهەموو گوناهباری وخەتاکاری یەم دەترسم٠ هەر کاتیش ئەو ئایەتانەی باسی بەخشین و لێبووردن دەکەن دەبیسم دەگەشێمەوە ودەروونم پڕدەبێ لە هیوا وهومێدی رزگاری٠"

پاش ماوەیەك وردبوونەوە لە هۆنراوەکان ونووسراوەکانی عاریفانی سەودا سەرودڵسووتاودا بە تایبەتی فیووزاتەکەی حەزرەتی عەبدولقادەری گەیلانیوحەزرەتی عومەری ئیبنوالفاریز(ابن الفارض) وهەستان ورۆنیشتن دەگەل پیاوی دینداروبە ئیمان بۆم دەرکەوت کە ئەو حاڵەتە بۆکەسانێك دێتەپیش کە باشتر مانای قورئان بزانن، وردتر سەرنج بدەن ولە خوێندنەوە حەزبکەن هەروا لە کاتی نوێژدا حزووری قەلبی یان بووبێ٠

– هەروەکوو بیستوومانە ئەم بڕوایە کە، **"باشترین نوێژ لە لای خوای مەزن ئەو نوێژەیە کە لە غەیری خواکەسی دیکەی تێدا حازرنەبێ، کەسی تری نێدانازر و فەرمانڕەوانەبێ، تە نانەت نوێژ کەرەکەش دە نوێژەکەی خۆی دا ون بێ وخەبەری لە دنیای دەرەوە ببڕێ"٠**

زۆرجوان وسەلمێندراوە٠

رەنگە ئەوپیاوەی باسمان کرد بەو پلە وپایە گەیشتبێ یا لانی کەم بۆنێکی ئەوگولستانەی کردبێ٠ زۆرم پێخۆش بوو بزانم چۆنە٠ سەرەنجام بەو ئاواتەم گەیشتم٠ ئەویش لە کاتێکدابوو دەبارەی بەسەرهاتی حەزرەتی مووسادا قسەی بۆ دەکردین٠ لە ناکاو رەنگی بزرکا دایە کلپەی گریان و نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا٠ پاش بێدەنگی وکش وماتی یەکی قورس دە درێژەی قسەکانیدا گوتی٠ زۆرتان لە مەڕئەوحالەتەوە پرسیار لێکردووم٠ ناتوانم دەبەرامبەر ئەوهەموو ئاه و

نالەی عاشقانە دا کە دەنێو
دەریای ئەوینی خودایی دا
مەلەوانن خۆم رابگرم • ئەو
عاشقانەی دەخوێن گەوزیون و
بە دەمی دەردە وە هاواردەکەن:
**"رَبِّ إِنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ • رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ • رَبِّ إِنْ لَمْ يَكُنْ بِكَ غَضَبٌ عَلَيَّ فَلَا أُبَالِي وَلَكِنْ عَافِيَتُكَ أَوْسَعُ لِي" •**

جوان وپەسندکراو دەواندا کۆ
بۆتەوە • هەریەکەش لەو
پێغەمبەرانە دەسیفەتێکی
تایبەتیدا بەناوبانگن • سەبرو
خۆراگری دە حەزرەتی ئەییوبدا،
دەنگ خۆشی حەزرەتی داوود، رەحم
ومیهرەبانی وبەشەردۆستی
حەزرەتی محەمەد( سەلامی خودای
لە سەربێ) بە ناوبانگە دەم
وتارەدا لەسەر ئەوین وسەوداسەری

ولەوێ یاساو ئائینی تەوحیدی
وەربگرێ وبە خەلکی رابگەیەنێ•
لەمەڕ وەزع وحاڵ و هەوای
کێوی توور دەو دەمەداکە دەبێتە
میعادو میقاتی دیدار دەگەل
باریتەعالا موفەسیران دەڵێن
بەرلەوە مووسابگاتە کێوی توور
بە ئەمری خودا تاحەوت فرسەخی
دەوروبەری کێو تاریك دەکرێ
وشەیتانیش ناتوانێ بۆ ئەو

**باشترین نوێژ لە لای خوای مەزن ئەونوێژە یە
کە لە غەیری خوا کەسی دیکەی تێدا حازرنەبێ
کەسی تری تێدا نازروفەرمانرەوانەبێ، تەنانەت
نوێژەکەرەکەش دە نوێژەکەی خوی دا ون بێ و
خەبەری لە دنیای دەرەوە ببرێ •**

بەرلەوەی ئەم ئایەتانە
مانالێدەمەوە ئەو مەتلەبەم
بەزەینی داهات کە هەروەك
خۆتان دەزانن کتێبی زۆر لە
سەر بەسەرهاتی پێغەمبەران(د •
خ) نووسراوە ولە خوێندنەوەی
ئەم کتێبانەدا زۆرشت بۆمان
روون دەبێتەوە بەلام هیچ یەك
لەوکتێبانە نەیانتوانیوە وەك
ئوستادانی ئێمە ئەو پێغەمبەرانە
بە باشترین شێوە بناسن و
بناسێنن•

بەواتەی مورشیدوئوستادانی
ئێمە پێغەمبەران نموونەی
ئینسانی تەواون• هەمووسیفاتی

حەزرەتی مووسا، سەلامی خودای
لێ بێ باس دەکەین•

حەزرەتی مووساخانووچکەی
دلی خۆی بۆ ئەوینی ئیلاهی
بە تاڵ کرد• ژەنگ وژاری خەم و
پەژارەی مالی دنیا و رق وکینە
وخۆشەویستی ئەوشتانەی
ناپایەدارن لە دڵ و دەروونی خۆی
رامالی وبە تەواوی بوونیەوە
بەرەو خودا رۆیشت• کە لکەلەی
دیداری یار لە مێشکی دا جێگر
ببوو وبەردەوام داوا لە خودای
مەزن دەکا کە خۆی نیشان بدا
وچاوی روون کاتەوە• سەرەنجام
بانگ دەکرێ کە بچێ بۆکێوی توور

هەریمە وەشوێن مووسا کەوێ•
سەرەنجام مووسای سەوداسەر
وعاشق دەگاتە کێوی توورحیجاب
وپەردە لە بەرچاوی هەلدەگیرێ
وبەرەو ئاسمان دەروانێ وبە
چاوی خۆی ئەوفریشتانە
دەبینێ کە عەرشی ئەعلایان
دەوردەداوە• مووسا وەهامەفتوون و
مەجزووب وسەراسیمەی ئەودیمەنە
دەبێ کە خۆی لە بیرنامێنێ و
غەرقی دیداری زاتی ئەحەدی
دەبێ• سەرەنجام وت وویژ لە
نێوان خوداومووسادەست پێدەکا
و ئەومونا جاتە چل شەوورۆژ
دەخایەنێ• چ رازونیازێك، چ دیدار-

## به مووسای فەرموو : ئەی مووسا لەوساتەوە تۆم خولّقاند حەزوخوازی من ئەوە بووە کە ببی بە هاودەم وکەلیمی من .

یك پڕلە ئەوین و شەیدایی و سەوداسەری وحەزوخۆشەویستی . بارانی رەحمەت وبەرەکەت و فەیزی ئیلاهی بەسەرمووسادا دەباری .. **(والقیت علیك محبة منی لتصنع علی عینی)** بە مووسای فەرموو : " ئەی مووسا لەوساتەوە تۆم خولّقاند حەز وخوازی من ئەوەبووە کە ببی بە هاودەم و کەلیمی من کەوابوو ئەوین و خۆشەویستی خۆم بەسەرتۆدا رژاند بۆ ئەوەی بتوانی بە جوانترین شێوە ئەرکەکانی سەرشانی خۆت بەرێوە بەری تاخۆ حاڵ وباری رووحی مووسا لەوکاتەدا کە بارانی رەحمەتی خودای بەسەردا دەباری دەبێ چۆن بووبێ ؟! دیارە هێزی ئەوکێش وجەزبەو شادمانی یەوای لێکردووە کە بێجگە لە دڵدارەکەی کەخودابێ بیری لە هیچ شتێك نەکردۆتەوە دەو تاسە ومەیلی دیدارە دایە کە مووسا دەڵێ :

**(قال رب ارنی انظره الیك)** و داوای دیتنی خۆشەویستەکەی دەکا وجوابی دەدرێتەوە **(لن ترانی)** یانی نام بینی، ئەو وەلامە دەبێتە هۆی کەسەروغەمێکی قورس کە وەك بەرداشێکی زۆرقورس گیان ولەشی مووسا دەهارێ پێی وادەبێ خودا لێی رەنجاوە . بەسەرهاتی خۆی لەوکاتەوە کە ئاوی چۆمی نیل لانکەکەی بردە ماڵی فیرعەون وەبیرخۆی هێناوە . هیچ خاڵێکی رەشی دەکردارو رەفتاری خۆیدا بەدی نەکردکە ببێتە هۆی نووڕەیی ودڵ ئێشاوی خوای مەزن. مووسا دەوفکرانە دایە . دەتەند - ووراوی حیرەت وسەرسوڕمان دایە دڵ شکاو وتێکشکاو، کە شەپۆلی رەحم وخۆشەویستی بەسەری دەکشێ و دیسان دەنگی خودای مەزنی بەگوێ دەگا **(ولکن انظر الی الجبل فان استقر مکانە فسوف ترانی)** . زەرڕەیەك نووری خودا ئەویش لە پشت حەفتا هەزار پەردەوە بۆ کێوی توور رەوانە دەکرێ . کێوی توور بەهەموو کەورەیی وسەرکێشی خۆیەوە دەسووتێ ودەبێتە کۆی زووخاڵ . مووسا کەئەوکارەساتە بە سامەی بەچاو دیت، خۆی بۆ راناگیرێ وبێ هۆش و مەجزووب دەکەوێ و ئاگای لە خۆنامێنێ . **( فلما تجلی ربه للجبل جعله دکا وخر موسی ."**

لێکدەرەوەکان ( مفسران ) دەفەرموون ماوەی لە هۆش چوونی مووساو بەهۆش هاتنەوەی ۲۴ ساعەت دەخایەنێ . یانی شەوی عەرەفات کاتی نوێژی عیشا لە هۆش دەچێ وشەوی دوایی لە هەمان کاتدا وریادەبێتەوە . دەبینێ کێوی توور دەو دیدارە دا بۆتە خۆڵەمێش بەلام دەوروبەری کە دەپێشدا بیابانی قاقڕبوو بۆتە گوڵستان ومێرگ وسەوز هەڵگەڕاون . ئەو رووداوە مووسا تێدەگەیەنێ کە دە بەرامبەر خودا دا ئینسان زەرڕەیەکی بێ میقدارە وهەرگیز ناتوانی دەبەرامبەری دا راوەستێ و پەی بە ناتەوانی خۆی دەبا **(من عرف نفسه عرف ربه)** . لە ئەنجامدا شوکرانە بەجێ دێنێ وداوای گوزەشت ولێبوورد- ووی لێدەکا . **(فلما افاق، قال سبحانك تبت الیك وانا اول المومنین )** .

ئەدەب ،جیهان لەمحەکی زمان دەداودەیخاتەبەرپرسیار. ئەگەرنووسەرلەزمان خافڵ بێ یا بەکەرستەی بزانێوتێکی بشکێنێ ناتوانێ دنیا بخاتە بەرپرسیار وئەوی مەبەستە بەباشی بینوێنێ وهەستی خوێنەرببزێوێ .ئەرکی ئەدەب

خستنی هێزی بیرکردنەوە و بزاوتن وهاندانی هەست وبیرو خەیاڵە .تەنانەت دەشگونجێ ئەرکی لێکدان ودڵ ئێشاندنیش بێ.جوانی بەڕاستی هەمیشە دەبێتە هۆی سوورمان. هیچ بەرهەمێک شایانی ئەم ناوە نیەمەگەررچەیەکی نوێ بۆ خەیاڵی خوێنەربشکێنێ .

وپاشەرۆژ رەچاودەکرێ(سارتر ) گوتوویەتی: "ئەدەبیات نیشاندان وناسینی جیهانە بە شێوە یەککەبڕوای بە ئازادی مرۆیە ."

هەروەها دەڵێ: "ئەدەبیات دەیەوێگشتی وجیهانی بێ. نووسەرئەگەربێەوێ لەگەڵ هەموان بدوێ وەهەمووکەس

# باسی ئەدەبی

■ ڕەحیم لوقمانی

ئەوەیە کەدەسەڵاتی خەیاڵ بۆفێربوون وتێگەیشتن بەیان بکاو بەڵگەونیشانەبدا بەدەستەوە .نابێ تدنیاقالبی ناسراووبەڵێن دراوبەناوی نموونەدەکاربێنێ ودا والە خوێنەربکا ، شتێکی تائەوکاتە نەپەرژاوەتەسەری بیری لێ بکاتەوە .

نووسەرتەنێ بۆچیرۆک گێڕانەوەوباس کردن وگوتن نانووسێ.دەیەوێ بەوەدی هێنا ـ نیبەرهەمەکەی شتێکی دی لە جیهاندا بخولقێنێ.

ئەرکی نووسەر نەفێرکردنە نەدڵدانەوە، بەڵکوو وەکار بایەخی زۆری چیرۆک ، ئەمەیە کەئەزموونی ژیان زۆرتردەکا.بۆ وەی بزانین ڕۆمانی نوێ لەناسینی مرۆدا چمان پێدەڵێ دەبێ بزانین کامجیهانی مومکینیبۆ دۆزیوینەوە.بۆئەم مەبەستەش نووسەرناتوانێ بێلایەن بێ دەنا دەبێ لەخۆی هەڵبڕێ. ئەدەب دەورێکەبەرەونیشاندانی دونیایەکی دیکە .

ئەدەب وەک دەروازەیەکە دەکرێتەوەوجیهانێکی دی نیشان دەدا .هەرلەمتێفکرین و بیرکردنەوەشدا ، ڕێیئامانج

بەرهەمەکانی بخوێنێتەوەدەبێ لەریزی زۆربەی خەڵکدابێ یانی لەریزی دوومیلیارد برسی دا ."

ئەدەبیات بەتەجرەبەوخەیاڵ وکردەوەئەرکی سیاسیواقیعی بەرێوەدەبا چون سەرچاوەی ئەوزنجیرەبڕیاروگەلالانەیە کەدنیای دەوروبەری مە بە گشتی دەگۆڕێ.

ئەرکی ئەدەب وسیاسەت کاتێک لەبەین دەچێ ، کە بنۆسی هاندەر وەکووتەوژمی سیاسی ـ قانوون سازی هونەر ـ

ی و . . .تێدا نەمێنێ. مەگەر ئیدی نووسەر خۆی لایەنی ئەدەبجێ بێڵێ وبەدڵ وگیان دەست بکا بە پێ هەڵگوتنی مەرامێکی سیاسی. کەوابوو ناشێ ناوی بنرێ نووسەر بەڵکوو ئەوە "قەڵەمگێڕە" و کالاکەشی بۆبالای خۆیەتی و هیچ پێوەندی بەئەدەبەوە نیە.

نووسەردەبێ دەردورەنجی خەڵک بەجوانی بچێژێ و ناکۆکی وکەمایەسی کۆمەڵایەتی وئەخلاقی بخاتە بەرچاو بۆگۆڕانی بنەڕەتی قانوونی کۆمەڵ،بیری خەڵک ببزێوێ و وشیاریان بکاتەوە.

هونەرمەندبەپێی ئەو ئەرکەی هەیەتی لەقەڕەقەشەی تاریکترین تەنگەژەی مێژوودا ـ یە.بەڕاستی هەونەر، مرۆ دەکێشێتە مەیدانی تێکۆشان و خەباتەوە.دیارە ئەمەش هێندێک جارگران بۆی تەواو دەبێ.

(ناتالی سارۆت) دەڵێ :" بۆنووسەردوو واقیعی یەت هەیە.یەکەم ئەوواقیعی یەتە کەتێیدا دەژی.واقیعی یەتێک کەهەموو کەس دەیبینێ وبە یەکەم سەرنج تێی دەگا و ناسراوە.یا دەگونجێ بەئاسانی بناسرێ .واقیعی یەتێک کەلە مێژە دۆزراوەتەوەوبەشێوەیە ـ کی دیاری کراو لەکۆنەوەپێک هاتووەو. . .گێڕانەوەوباس کردنی ئەم واقیعی یەتانە کاری رۆژنامە نووسە.ئەمە مەودایەک نیە نووسەر خولقاندنی تێدا بنوێنێ. واقیعی یەتی دووەم شتێکی ، دیکەیە کەهێشتا نەناسراوە ولە قالبی کۆن ونوێدا نەگونجاوە.(پۆل کلی) وێنە کێشی ئاڵمانی دەڵێ:"هونەر شتی دیارو بەرچاونا گێڕێتەوە. بەڵکوونادیارئاشکرادەکا."

هونەر چڕاستی یەک ئاشکرا دەکا ؟ شتێکە باس لێ کردنی دژوارە. شتێکە لەزۆرماکی* بەربلاوپێک هاتووە .زەینمان بۆبوونی دەچێ بەلام بەئاشکرا هەستی ناکەین .گەلێ ماکی بێ قەوارە کەلەژێرخاکدا بێ گیان کەوتوون ونوستوون و لەنێوگەلێک ئیمکانوگونجاندا ون بوون،تواونەوەولەژێرزۆر توێی دیاروبەدیدا* شارد راونە ـ تەوە. هونەرمەند ئەم ماکانە دەردەکێشێ وکۆی دەکاتەوەووێنەیەکی هونەری وئەدەبی لێ پێک دێنێ.

زۆربەرهەمی بەنرخی ئەدەبی واقیعی یەتی دیارو ئاشکرا رەچاودەکا وبناغەی کاری بابەتەکانی کۆمەڵایەتی وسیاسی وئەخلاقی یە.( وەک ئەوەکە لەکاتێکی دیاری ، کراوی مێژوودا هاندەری هێزەکانی کۆمەڵە.)کە چی بەم مەسایلە ئاشکرایە بە واقیعی یەتی نهێنی ونادیار دەگەن.

لەم بارەوە ئەدەبیاتی دەروەست زۆر شوێنەواری رەسەن وبەنرخیبووەودیسانیش دەیبێ.بەلام ئەوەشمان لەبیر نەچێ کەزەبروزەنگی ئەخلاقی ئامانج ومەبەست هەرچەندە بەرزوپاکیش بێ، مادامزۆری لەگەڵ بێ ناتوانێ نووسەر ناچاربەنووسینی بەرهەمی دەروەست بکا وراستی یەکان بخاتە بەرچاو.

لەم مەیدان ورێبازەدا ، باشترین ئازادی وزۆرترین دەسەلاتی بەدیهەبێژی شەرتی پێوست وواجبی کارە.لێرەدا ئیرادە توانایی ودەسەلاتی نیە. (سزان) وێنەکێشی فەرانسەیی گوتوویەتی:"هونەر ریشەی بوون وسەرچاوەی نادیاری هەست دەگرێتەدەست."

نووسەر لەبەرامبەر ئەم راستی یەنادیارونەناسراوەدا بەتەنێ ماوەتەوەچون هەست دەکا یەکەمین کەسە ئەوشتە دەبینێ .لێرەدا گومان بە سەریدا زاڵ دەبێ و کەس ناتوانێ رێنوێنی بکا .تەنیا خۆی داوەری ئەوشێوەورێبازە ـ یە کەبیخولقێنێ بۆئەوە بتوانێ واقیعی یەتی خۆی ببینێتەوە .ئاقیبەتی نووسەر ئەم واقیعی یەتەی کەس تێی نەگەیوە ، لەقالبی خۆیدا دایدەڕێژێ .دیارە خێراهەموو کەس لێی وەرناگرن ورەنگە ببێتە هۆی ناڕەزایەتیش . چون واقیعی یەتی ئاشکرای رۆژانە کەدەور وبەرمانی گرتووە بۆتە کۆسپی نێوان

ئێمە وواقیعی یەتی تازە و
شاردوویەتەوە هەرکام لەئێمە
زووتێدەکۆشین تائەم کۆسپە
نامۆو زەرەردارەی کەپێش
ئەم واقیعی یەتەی لێ گرتوو-
ین ،لەنێوبەرین.

بەرهەمی تازە یانی
دەرخستنی واقیعی یەتێک کە
تا ئێستا نادیاربووە .دیارە
ئەم کارەش بەکەرستەیەک
دەکرێ کە بۆ دۆزینەوەو
لێکۆڵینەوەی پترپێ داگرێ و
خۆراگرێ ورێگەببڕێ.

نووسەرلە ڕێگەدانابێ
ئەهلی هاوهەنگاوی وسازش بێ
(بودلێر)گوتوویەتی:"شالاوی
هێرش بردنی نووسەردەبێ
لەهێزی خۆڕاگرتنی هەزاران
کەس مەزنتربێ.

بەرهەمی نووسەرانی
ناوداری ڕابردوو نیشانمان
دەداکەزۆر رق ئەستوور و
بێ باکانە ، لێکۆڵینەوەی
خۆیان درێژەداوەهەرئەم وەدوو
کەوتنەبێ پسانەوەیە کەدنەی
داون وهاتوونەسەرئەوەی ئەو
بەڵێن وشێوە کۆنانەی پێش
واقیعی یەتی تازەیان گرتووە،
لابدەن وشێوازی تازە بۆ
بەرژەوەندی کاری خۆیان وەدی
بێنن هەرئەم بێباکی وجسارەتە
- یەبۆتەزامنی مانەوەی
بەرهەمەکەیان.چون
واقیعی یەتێک کەیەکەم جار
ئەوان دۆزیانەوەولێکیان
داوەپاش تێپەڕبوونی زەمان
بۆتە واقیعی یەتی ناسراوو
بەرچاو.

بەم جۆرە لەئەدەبیاتدا
بزووتنەوەیەکی دایمی هەیەکە
لەدیار بۆنادیار،لەئاشکرا
بۆنەدیو،لەناسراوبۆنەناسراو
دەڕوا .بەم ئاڵ وگۆڕە هەمیشە-
یی شێوە وقالبی واقیعی یەتی
نادیار،دەبێتە بەشێک لە
واقیعی یەتی ئاشکرا . لە
لایەکی دیکەوە لێکۆڵینەوەی
تازە دەبێتە دۆزینەوەی
واقیعی یەتی تازە ودیسان
نەناسراو .ئەم بزووتنەوە
هێندە تەبیعی وپێویست
وبەردەوامەکەگوتوویانە :
"سوننەتی هونەر و ئەدەبیات
کێشەیەلەگەڵ سوننەتدا ."

لەژیانی مرۆدا سۆز و
هەست وغەم وشادی رەنگەکەم
تاکورتێک دەوام بێنن
بەڵام هەرچۆن بێ لەبەین
دەچن.ئێمەناتوانین بێبڕانە-
وە ئەوانە لەخۆماندا ڕاگرین.

لەولاشەوە ئەمە نوکتەیەکی
بنەڕەتی یەکەهیچ فکرو
هەستێک ناتوانێ بەتەواوی بە
سەرژیانماندا زاڵ بێ.

هۆش وبیرکردنەوە ناتوانێ بە
تەواوی وبەوردی هەموورووداو-
ێکی ڕابردوو وەک خۆی زیندوو
بکاتەوە .مرۆتەنیا بەشێوەیەک
دەتوانێ،دڵەکوتەی مردن ،
هەست بەدامان وڕامان یا
ئۆخژنی سەرکەوتن ،یاهەستێ
کە بەدیتنی گوڵی ئەرخەوان
لەتازەلاوێک دابەدی دێ و....
بەوپەڕی بەرزی بگەیەنێ.

تەنیا ئەدەبیاتەکەدەتوانێ
بوونی ئەو(کاتانە)وبەردەوا-
می ئەوانە،کەتائەبەدزیندوو
دەمێنن، بگێڕێتەوە .کەوابوو
وشە لەگەڵ زەمان بەشەڕدێ لە
گەڵ مەرگ وجیابوونەوەش بە
شەڕدێ چون ئەوتوانایەی
هەیە وئەوەش ئەرکی پێوست
وگرینگی وشەیەکەسایەتی

ژیان، تێپەڕبوونی زەمان
چێژی مەرگ وژیان وتەنیایی
و...بکاتەشێوەی گشتی.

هەرنووسەرێک بەشێوەی .
جۆربەجۆررووەدەکاتە ئەدەب،
بەڵام هیچ کەس ئەگەر خۆی
بەشێوەیەک ڕەنجیجیابوونەوە-
ی نەچێشتبێ وهەوڵی بۆ
نەهێشتنی ئەم جودایی یە
نەدابێ ،چدەنووسێ؟!

زۆر دەبینین کە مرۆ
تووشی ناهومێدی دێ.لەم
کاتەدائەدەبیات مەحاڵەچون
ناهومێدبوون هیواوپشتگەرمی
لەدڵ دەردەکا .ئەگەرلەکاتی
ناهومێدیدا نووسین مەحاڵە
دەتوانین بڵێینکەئەدەبیاتی
ناهومێدی هەرنیە.بەڵام کەمتر
ئەمڕاستی یە قەبووڵ دەکەن.
لەڕاستیدا ،ئەگەرکەسێک باسی
دڵەکوتەی خۆی دەکا بۆئەوەیە
کەدەزانێ باسەکەمانای
هەیەوئەوکەسە هێشتا
ئیمانی بەپێوەندیوهاوفیکری
هەیەوئیمانی بە ئینسان و
برایەتی مرۆیە .

ئێمەئەگەر باوەڕوهیوامان
بەئامانج وداهاتوونیە ،نابێ
تێشکان وبەدبەختی وژیانی
کەسان وەبەرچاونەگرین.

ئەگەر ئەدەبیات بیەوێ کە
تەنگانەی جودایی‌تێپەڕێنێ ،
بەتایبەتی وەختێک ئەوجیا
بوونەوە چارەیەکی نەبێ،
دەبێ لەدڵەکوتەوتەنیایی و
مەرگ بدوێ .چون ئەمە هەر
ئەوکارانەن کەئێمەیان لە
کەسایەتی خۆماندائەسیر
کردووە .ئێمەپێویستیمان
بەوەیە تابزانین وهەستی
پێ بکەین کەئەم ئەزموونە
بۆئینسانی دیکەش هاتۆتە
گۆڕێ.

زمان دەمانخاتە
کۆمەڵگای ئینسانەوە و
دەمانکابەئەندامی کۆمەڵ.
ئەگەر وشەیەک بۆباسکردنی
چارەڕەشی وناهومێدی پەیدا
بێ ،ئیدی هەستی جیابوونەوەو
دووری،لەکۆمەڵدا نامێنێ
دەردێک کەهاودەردی دەوێ و ،
مرۆپتربەرگەی دەگرێ.کەوا
بوو دەبێ لەبارەی تێشکان
رسوایی ومەرگەوەقسەبکرێ
وبنووسرێ.ئەڵبەت نەبۆ
ئەوەی خوێنەرناهومێد بێ.
بەڵکووبەپێچەوانە بۆ وەی
بتوانین لە ناهومێدی
رزگاری بکەین.

هەرمرۆیەک پێوەندی
بەئینسانی دیکەوەیە . تەنیا
لەرێی ئەوانەوەهەست بە
بوونی خۆی دەکا . پێزانینی
بوونی خەڵکی دیش بەهۆی
چۆنەتی دەروونیان یابە
هۆی بوونی خۆمان کەهەربە
تیشکی وان ڕووناک بۆتەوە ،
دەکرێ. ئەمەکارێکەئەدەبیات
دەتوانێ ودەبێ‌بیکا.ئەدەبیات
دەبێ تاریکترینونادیارترین
حاڵەتی دەروونی ئێمەبۆیەکتر
روون بکاتەوە .

پاراستنی ئینسانی‌ترین
چۆنەتی وحاڵەتی مرۆ لە
بەرانبەر ژیانی ماشێنی و
ژیانی ئیدارەو هەروەها
تێگەیشتن وباسکرنی جیهان
بەپێ ودانی ئینسانی‌بەوجۆرە
کەبۆهەموان ئاشکرابێ،
یانی ئەوکەسانەکەپێوەندی-
یان پێکەوەیە ، کەچی‌لێکیش
جودان و...ئەمانە هەموو
ئەرکی ئەدەبیاتە ■

ئەدەبی ئیتالیا سەرەتا کۆمەڵێك بوو لە غەزەل و واژە و شێعری ئەویناری وجەنگی و بەزمی کە بە هۆی شاعیرانی گەراڵ و چیرۆك بێژان (نقال) بۆ خەڵك دەگوترا وە . یا لە گەڵ چەنگ بە گۆرانی دەخوێندرانەوە و خەڵکی ئیتالیا زۆریان حەز لە بیستنی ئەو گۆرانی و شێعرانە دەکرد .گۆرانی بێژان وچیرۆك بێژانی ئیتالی جاربەجار وشەی فەرەنسی یان تێکەڵی وتە جوانەکانی خۆیان دەکرد . هەروەکوو زانیومانە لەدەور وبەری چەرخەکانی دوازدە وسێزدەی زایینی دا ،هەرشارونا وچەیەکی ئیتالیادەسەڵاتدارێکی سەربەخۆ ی بووە ،بەڵام یەکگرتوویی لەنێوانیان نەبووە و زوربەی زاراوەکان دەگەڵ یەکتر جیاواز بوون . بەم حاڵەشەوە لە سەردەمی " فردریکی دووهەم " دا زمانی ئیتالی لە سیسیل و تووسکانی دەکار هێنرا و ئەو شاعیر و گۆرانی بێژانەی کە بە ئیتالی شێعر یان گۆرانی یان دەگوت ، لە نگەر پەر دازانی (قافیە پردازان) سیسیل و تووسکانی یان پێ دەگوترا .

مامۆستا و پێشەوای ئەم جۆرە شێعرە لە ئیتالیا کابرایەك بوو بە ناوی " گیدۆگینی چل [Guidoguinceli] دانیشتووی " بۆلۆنیا " کە لە ساڵی ۱۲۵۴ی زایینی کۆچی کردووە و لە هۆنینەوەی غەزەلی بە سۆزی ئەویناری دەستێکی با ڵای بووە و بگرە کارتێ کردنی شێعرەکانی ئەم شاعیرە گەورەیە لە پەروەردە کردنی فیکری و گەشە پێدانی مرخی ئەدەبی " دانتە لیگری" دەورێکی با ڵایان نواندبێ .دانتە هەمان شاعیر و نووسەری گەورەی ئیتالیایە کە خاوەنی کورتە چیرۆکی " ژیانی نوێ" و " کومێدی" ئیلاهییە و لە نێوان ساڵەکانی ۱۲۵۶ ـ ۱۳۲۱ " دا ژیاوە . هۆی کاریگەر و سەرەکی لە نووسینی ژیانی نوێ و کۆمێدی ئیلاهی دا لە لایەن دانتەوە ، ئەوینێکی ئاسمانی بووە بە کچێك بە ناوی " بئاتریس پۆرتی ناری " و ئەم ئەوینە لە تەمەنی ۱۰ ساڵانەی شاعیر تا دوا رۆژی ژیانی بەردەوام بووە . و لە پاش مەرگی بئاتریس ژنی نەهێناوە . تەنانەت پاش مەرگی بئاتریس ، دانتە قەت ئەوی لە بیر نەچۆتەوە . شەوێك لە خەوندا دەبینێ و ئەم خەونە دەبێتە هۆی نووسینی بەرهەمی بایەخدار و جیهانی کومێدی ئیلاهی . لە زۆر جێگەی پەڕاوەکەدا بئاتریس وێنەی تیشکی پرشنگدار و هەتاوی رووناك و پارێزگاری و جوانی و خێر و بەرەکەتی تەواوە .

کومێدی ئیلاهی وێنەیەکە لە چەرخەکانی ناوەڕاست بە رەوشت و رەفتار و دوو بەرەکی و جەنگ و روا لەتە ناو دارەکانی و شارستانیەتە کۆنەکانی و هەر وا لەم پەڕاوە مەزنەدا چەند دیمەنی کاریگەر و وێژا ( گۆیا ) لە مێژوو پێش چاو دە کەوێ و زۆر شانۆ و ئۆپێراش لەم پەڕاوە وەرگیراوە .

دانتە بێجگە لە ئەو دوو پەڕاوە هێندی پەڕاوەی دەربارەی فەلسەفە و رامیاری نووسیوە ، کە لەو پەڕاوانە دا دوو خاڵی زەق لە هەموان پتر بەر چاو دەکەوێ یەکەم بە دی هێنانی زمانێکی ئەدەبی ئیتالیایی و دووهەم کە لە پەڕاوێك بە زمانی لا تینی نووسراوە پێویستی دامەزراندنی حکوومەتیکی جیهانی بۆ یەکەم جار دەرخستووە و بە زۆر بەڵگان سەلماندوویەتی کە بۆ پاراستنی ئاشتی و ئازادی دەبێ رێکخراویەکی جیهانی لە هەموو وڵاتاندا پێك بێ و ئەم رێکخراوە

داوە ریەکی " محکمەی نێو دەوڵەتانی هەبێ و ئەوەندەش هێز و توانایی هەبێ کە بتوانێ بڕیارەکانی وڵاتانی ئەندام بە کردەوە بە ڕێوە بەرێ.

پتر ئارك " ١٣٧٤ - ١٤٠٤ " لەو شاعیر و نووسەرانەیە کە سۆز و ئەوینێکی زۆری لە دڵدا بووە سەبارەت بە وڵاتی ئیتالیا و خەڵکەکەی . دوو بەرهەمی گرینگی لێ بە جێ ماوە کە لە وێژەی ئیتالیا جێگای دیاریان هەیە :

١ - سەر کەوتنەکان

٢ - ئەفریقا

ئەم وێژەوانە چەندین بەرهەمیشی بە لاتین هەیە.

جیوانی بووکا چیو " ١٣١٣ - ١٣٧٥ " لە شاعیران و نووسەرانی ناوداری ئیتالیایەکە زۆری حەز لە ئەدەبی کۆنی یۆنان و رۆم دەکرد و چەند پەڕاوی بە لاتینی نووسیوە. بەرهەمەکانی بریتین لە :

دوو پەڕاو لە بارەی : " مێژووی بە سەر هاتی پیاوژنانی ناودار - چیاکان - دارستانەکان - کانیاو و رووبار و دەریاکان و ..."

پەراوێك لە بارەی " ئەفسانەکانی شوانانە و چۆپانی" بە ناوی ئامێتۆ [ Ameto ]

دکامێرۆن [ Decamevon ] کۆمەڵێکە لە سەد چیرۆك .

بناغەی پەڕاوی دکامێرۆن پێك هاتووە لە بەسەرهاتی تاقمی ژن و پیاو کە دەیانەوێ لە بەر تاعوونی ساڵی ١٣٤٨ ی فلۆرانس هەڵبێن و پەنا بەرنە خانوویەکی کوێستانی و هاوینە هەوار . و لەوێ دەست دەکەنە ئەفسانە گێڕانەوە . چون خوو و رەوشتی چیرۆك بێژان جیاوازە ، لە بەر ئەمەش چیرۆکە کە چێژو تامێکی تایبەتی هەیە.بە گشتی وەسفی شاعیرانە و ئامۆژگاری وخەمگینی بەو پەڕی ناسکی و هەستیاری تێدا بەر چاو دەکەوێ و چون نووسەر زانستی پێویستی لە بارەیرووحی مرۆڤانە و پالەوانە - کانی چیرۆك هەبووە،هەموویان قارەمانەکانی زیندوو و پڕ لە خۆشەویستی ژیان دێننە پێش چاو، تەنانەت گیانلە بەرانیدکا مرۆنیش.

ئەم پەڕاوە واتە " دکامێرون " پاشان لە ئەدەبی هێندێ وڵاتان وەك ئینگلتەرە لاسایی کرایەوە و کەلکی لێ وەرگیراوە . شوێنی لە هێندێ بەرهەمی " **چاسر** " و " **کیتس کە** " **بریتانین و لانگ فێلۆی** ئەمەریکی دەبینرێ.

راپەڕینی بووژانەوە " **رۆنیسانس** " لە ئیتالیا بوو بە هۆی گەشە پێدانی زمانی ئیتالی و **پیترۆ بەمبۆ** لەو کەسانە بوو کە لەو سەردەمە بە پێرەوی لە دانتە بۆ بەدی هێنانی زمانێکی میری " رەسمی : " و گشتی ئیتالی لە سەرانسەری ئیتالیا تێدەکۆشا و پاشان قامووس و رێزمانی ئیتالی ئامادە و چاپ کران .

فەرهەنگستانی " دل لاکرووسکا "ش کە لە ١٤٨٥ ی زایینی لە فلۆرانس دامەزرا بەرە بەرە دەسەڵاتی زمانی لاتینی کەم کردەوە و بە هەمان رادە شکۆ و پەرە پێدانی زمانی ئیتالیایی بردە سەرەوە . " **لۆدا ویکۆ راریۆ ستۆ** " پەڕاوێکی لە بارەی بە سەر هاتی پاڵەوانانە بڵاو کردەوە بە ناوی " **رۆلاندی شێت** " کە زۆر بایەخی پێدرا .

" **تۆرکواناسۆ** "پەڕاوی " ئۆرشەلیمی رز گارکراوی" هۆنیەوە کە گوایە بە سەرهاتی رزگاری بەیتو لموقەدەسە لە دەست مسوڵمانان کە زۆری لایەنگری لێکراوە . بەم پەڕاوە و پەڕاوەکانی تر دەوڵەمەندی زمانی ئیتالی رۆژ بە رۆژ پەرەی سەند .

پەڕاو و بەرهەمەکانی **ماکیاولی** وەك "شەهریار"،ناوبانگێکی بەرزی لە ئیتالیا و جیهان دایەوە. بەڵام پەڕاوی شەهریار بوو بە داردەستێك بۆ زاڵمان و خوێن مژانی مێژوو . لۆیی شازدەهەم ، ناپلیۆن ، هیتلەر و ... هەموو کات نوسخەیەکیان لە م پەڕاوە پێ بووە و بە خوێندنەوەی، وانەی دوو روویی و خیانەت و جینایەتی دەر حەق بە خەڵکی هەژار لێ فێر بوون . پەڕاوی **دەرباری** بەرهەمی " کاستی لیۆنە (کە لە راستیدا باسی داب و نەریتی ئامو شۆ دەکا و لە لایەن ئەو کەسانەی کە دەیانویست ئەدەب زانبن زۆرنرخی پێ درا .

کاتێ کە ئیتالیا کەوتە ژێر رکێفی ئیسپانیاوە ، سەرچاوەی ئەدەب و زانستی ئیتالیا بەرە و هەرەس هێنان و وشك بوون هەنگاوی هەڵێناوە . لە بەر ئەوەی بیر و بڕوای هەر زانا و وێژەوانێك

بکەوتایە ژێر شك ، شمشێری خوێنرێژو و بێ روحم چاوە روانی دەکرد و بۆ ماوەیەك ئیتالیا لە شاعیر و نووسەر و زانا بێ بەش کرا تا بەرە بەرە دوژمنانی ئایینی مەسیحی یەت بەرەو لاوازی رۆیشتن و دەسەلاتی ئیسپانیا لە ئیتالیا دا کەم بۆوە .

یەکێك لە جینایەتەکانی لایەنگرانی دەمارگیری "قشری" مەسیحی یەت سووتاندنی **جیۆردانو برۆنۆ** بوو کە رێکەوتی فەوریەیی ١٦٠٠ ی زایینی رووی دا.

لە چەرخی هەژدەهەم دا ئیتالیا دووبارە گیانێکی نوێی هاتەوە بەر و هێندێ شاعیر و نووسەر پێ یان نایە مەیدانی ئەدەب. بۆ وێنە : " **ویتۆریۆ ئال فیێری** " تراژێدی یەکی رێك و پێك و بەرزی نووسیوە کە بە راستی کۆمەڵێکی گەورەیە لە تراژێدی یەکانی ئیتالیا .

لە چەرخی نۆزدەهەم دا **لئۆپاردی و کاردۆچی** سەریان هەلدا و بە خولقاندنی بەرهەمی بە نرخی وێژەیی ناو بانگێکی بەرزیان لە ئیتالیا هێنایە دەست . تەنانەت کاردوچی خەڵاتی ئەدەبی نۆبێلی ئاراستە کرا و بەم شێوەیە بۆ یەکەمین جار ئەم شانازی یەی بۆ ئیتالیا هێنایە دەست .

**مان تسۆنی** : لە نووسەرانی چەرخی بیستەمی ئیتالیایە . پەڕاوی " دەزگیران " بەرهەمی ئەوە کە وەرگێر دراوە تە سەر زوربەی زمانە زیندووەکانی جیهان و سەر چاوەکەی چیرۆك نووسی مێژوویی یە .

لە وێژەوانانی چەرخی بیستەمی ئیتالیا ، شاعیر و نووسەری ناودار " **گابریلە دانونزیۆ** " دێتە پێش چاو لە شانۆ و شێعر دەستێکی باڵای بووە و هەڵەی گەورەی ئەو هاوکاری دەگەڵ فاشیستەکانی ئیتالیا بوو ، و لە ساڵی ١٩٣٨ ی زایینی کۆچی کردووە .

" **پیر ئاندلۆ** " ١٩٣٦ - ١٨٦٧ " لە نووسەرانی گەورە و ناوداری ئیتالیایە . بەرهەمێکی زۆری خولقاندووە کە وەرگێر دراوەتە سەر زوربەی زمانە زیندووەکانی جیهان و خەڵاتی نۆبێلیشی وەرگرتووە.

هێندێ لە بەرهەمەکانی بریتین ، لە : کۆمەڵێ کورتە چیرۆك،شانۆی شەش قارەمان، بە دوای نووسەرێك و بەو شێوەیە منت بوێت.

" **ئەو جنیۆ مۆنتالە** " : شاعیر و نووسەر و رەخنە گری ئیتالی لە ساڵی ١٨٩٦ لە شاری جێنوا لە دایك بووە. پاش هەڵبژاردنی چەند کار وپیشەی جۆراو جۆر لە ساڵی ١٩٢٦ رۆیشتە فلۆرانس تا لە دامەزراوەیەکی چاپەمەنی ئیش بکا . لە ١٩٢٩ تا ١٩٣٨ بە رێوەبەری " کابینەی زانستی ئەدەبی " بوو و چون ئەندامی پارتی فاشیستەکان نەبوو مەجبووریان کرد لەو پێتەختە دەست هەڵگرێ. ماوەیەك نووسەری دوو حەوتوویی بوو. چوار پەڕاوی شێعری بلاو کراوەتەوە و لە ١٩٤٧ دا بوو بە رەخنەگری ( منتقد ) مۆسیقایی و ئەدەبی و دەگەڵ رۆژنامەیەکی نیشتمانی هاوکاری دەکرد.

نووسراوە پڕژو بڵاوەکانی لە چەند بەرگدا چاپ کراون و هەر وەها هێندێ بەرهەمی کردۆتە ئیتالی ، لە شکسپێر ، ملۆبل ، کۆرنی و ...

" **سالوا تۆرە کاسینۆ د ۆ** " لە شاعیرانی ئیتالی یە ، لە ساڵی ١٩٠١ لە سیسیل لە دایك بووە . پاش خوێندنی رشتەی موهەندیسی ساختومان ، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٨ تا ١٩٤٠ دا بوو بە یاریدەدەری بەرێوەبەری تمپۆ.

لە ساڵی ١٩٤١ کرایە مامۆستای ئەدەبی ئیتالیایی لە هونەرستانێك و بە هۆی تێکۆشانی و بیر و بڕوای دژی فاشیستی لە لایەن فەرمانبەرانی مۆسۆلێنی بەند کرا .

لە ساڵی ١٩٥٩ لە گەڵ " دیلەن تۆ ماس " شاعیر و نووسەری ئینگلیزی خەڵاتی نۆبێلی وەرگرت . ئەم شاعیرە بە توانایە لە بارەی لێکوڵینەوە و وەرگێڕانی ئەدەبی ، گەلێ بەرهەمی چاکی پێش کەش کردووە وەك:

وەرگێرانی هێندێ لە بەرهەمەکانی شکسپێر و کامنیگز ئەمریکی بۆ سەر زمانی ئیتالی ، لە ساڵی ١٩٦٨ کۆچی دوایی کردووە ●

سێهەم مانگی پایز بوو. هاژەی دڵتەنگ و گڤەی بە سامی رەشەبای تووڕە گەردەلوولی بانانی رادەماڵی، چاوی کوڕوکاڵی کۆڵانی ئازار دەدا، کاکۆڵی شانە کراوی ئاڵۆز دەکرد و ریشووی شەدە و تۆپی دەسماڵی هەوری دەشەمزاند. باڵندە سەر لێ شێواوەکان بە پەلە خۆیان دەپەنا و پەسیوان داخنی. وردە وردە لاپەڕەی تەمەنی زستانیان لە سەربانەکان ڕافڕێ دەدا، بەفر دەماڵدران و بەفرانباریش تێدەپەڕی. ئەو جار نۆرەی ریبەندانە ئەویش بە زەبروزەنگی توند و بێ بەزەیی هوروژمی هێنا وەتە سەر گوند. گەنمی چاڵان و ئاردی ئ شان تەواو بوون. دانەوێڵە لە تونگە و دیزە و کووپە و هەمبانان بڕا، بن هەرزاڵ چۆڵ بوون مەیدانی بە خوری پشکنین وتەشی رستن و... شەویان شەق کرد. ئەو شەوانە هاتن و چوون و لە تەمەنی زستان کەم بۆوە. رەشەمە هات. فەقیری رووت و هەژار ئەو جارەش لە مەترسی بەستنی پاشلێوە لەرزە رزگاریان هات، تیشکی هەتاوی بەهار هەموو دوندو بنارو شارو گوندی گرتەوە. هێزی زستانی بڕی، رەشایی

# زستانی لادێ

■ خدر میرسەیدی

پایزی زەرد پەرپەر دەبوو، نۆرەی هاتنی وەرزی زستانە. زستانی لاو، لاوی تووڕە و تۆسن، رووگرژ و لە خۆبایی و لە سەرەتای مانگی بەفرانباردا .بەفر و کرێوە بەشەو و رۆژ لە سەربان و حەوش و کۆڵان، منداڵی رووتی رێگای قوتابخانە و هەموو بوارێکی شەکەت دەکرد. بوومە لێڵی بەیانی لاوانی گوند دیاری رمبازێنی مشکان بەتاڵ بوو. کاروان پەکیان کەوت کێوەکان کونەبڕ* بوون و لووساوەکان شەمشێرەیان بەست. ئاژەڵ لە تەویلە و باڵندە لە هێلانەدا مانەوە. رێگاوبان بەستران. کۆ بوونەوەی شەوانەی خەڵکی لادێ دەستی پێکرد، شەوانە پیاوان بە میرمیرێن و جۆرابێن و دەیان بەزمی دیکەی کوردەواری و ژنان کەوتە وڵات. کاریلە وبەرخ لە قەراغ دێ و لاپاڵ و شیوان وەجم و جۆڵ کەوتن باڵندە هێلانەیان ساز کرد. جوو تێران گاسنیان سەر کردەوە. خاوی وڵاغانیان شکاند و بەرە و مەزرا وەڕێ کەوتن و بەهاری ساڵی تازەیان دەست پێکرد.

# تراوێلکە

■ فایق ناسری

پەشۆکاوی لەدەروونمدا شەپۆلی لێدەدا . وەک شتێک دەترسام و نەمدەتوانی تەماشای سەرۆکی دادگا کەم ...

هەرچۆنێک بوو، هێندێک بەسەر خۆمدا زاڵ بووم و لەکاتێکدا دەمەویست خۆم بەهێز نیشان دەم، گوتم :

- سەرۆکی دادگا .... ڕەنگبێ من و خێزانمت لەبیر مابێ . چونکە تا ئێستا چەند جاری تریش هاتووینە ئێرە .... ڕاست دەوێ نازانم لەکوێوە دەس پێبکەم و چۆنی درێژە پێبدەم .... بە هەرچۆنێک بێ، زۆر بەکورتی عەرزتان دەکەم :

- " منداڵ " .... بەڵێ " منداڵ " ... تەنیا هۆی جیابوونەوەی من و خێزانمە . بە بڕوای پزیشک خێزانم ناتوانێ خاوەن منداڵ بێ . ئەمەش شتێکە بۆ من دژوارە و پێم قەبووڵ ناکرێ . قانوونیش لەم بارەوە دواوە و مافێکی بۆ من دیاری کردووە .

کاکی سەرۆک .... ئەوە مافی منە کە باوک بم و دەنگی گریان و پێکەنینی منداڵەکانم لە ماڵێ گوێ لێ بێ ... چۆنی دەربڕم ؟ نازانم . بەکورتی " هەر " شتێک کە باوکێک دەیەوێ بە تەواوی ئاواتەکانی یەوە ."

تەنیا تکام ئەوەیە کە هەرچی زووتر پەروەندەی ئێمە بخەنە بەرچاو، چونکە ئەمن پێم وایە ژنێک کە نەتوانێ ببێتە " دایک " لەلای من بێ بایەخە و ناتوانم چیدی لەگەڵی دانیشم و شەوی لەگەڵ ڕۆژ کەمەوە . تائێستاش کە ئاوا لەنێو خەڵک " بەرچاو " بووم، ئێدی بەسمە .... وەک دەڵێن : " دەرکی دەروازەی دەبەسترێ، زاری خەڵکی نابەسترێ . "

سەرۆکی دادگا بە شێنەییەکی تایبەتی گوێی بۆ شل کردبووم، لەوە دەچوو کە دەیەوێ ڕای خۆی دەربڕێ ...

- خوشکی بەڕێز ، قسەکانی مێردەکەت گوێ لێ بوو، قسەکانی دروستن یا نا ؟ ئەگەر تۆش لەم پێوەندی یەدا قسەیەکت هەیە، فەرموو .

" توبا " بە هێمنی دەستی پێکرد وەک دەنگێک کە لە قووڵایی یەکەوە بێتە دەر گوتی :

- " کاکی سەرۆک، ئایا ژنێک کە بە هەموو جۆر لەگەڵ مێردەکەی سازاوە، دەتوانێ باسی جودایی بکا ؟ من نامەوێ لە مێردەکەم جیا بمەوە . هیچ کاتیش نەمویستووە زۆرجاریش لەمەڕ منداڵەوە قسەم لەگەڵیا کردووە .... کاکی سەرۆک چۆنی دەربڕم ؟ پیاوێک کە چکۆڵەترین بایەخ بۆ ژنی خۆی دانەنێ چۆن دەتوانێ چاوەڕوانی منداڵیش بێ ؟

شه رم له راستی گوتن بۆته قفلێك به ده ممه وه ٠ خۆزگه توانیبام هه موو شتێکم ده ربڕیبایه ٠ ئه ده ی دژواری و چه ڵه مه کانی ژن و مێردی ؟ ناتوانم ٠٠٠٠ ناتوانم ده ریبڕم٠٠٠ به ڵام ئه وه ده زانم که ئه م چه ڵه مانه ،بیانوویه که بۆ ته ڵاق ٠ ئاخر من تا ئێستا بۆ مێرده که م هه ر وه ك کالایه ك بووم و به س ، بێ چکۆڵه ترین هیوا و مانی ژیان ٠٠٠ به ڵا م هیچ ٠٠٠بۆچی ٠٠٠ له به ر ئه وه که ویستوومه و ده مه وێ بژیم ٠

به ته شه ره وه گوتم :

–"به سه خانم ، لێره دا کاری من و تۆ له گه ڵ دادستێن و دادگایه ٠ خۆ به ر ده رگای ماڵێ نیه، بۆ ژنه هاوسێکانمان ده ردی دڵ بکه ی و ده س بکه ی به قسه ی منداڵانه ٠٠٠له مانه گه ڕێین ، من به هیچ جۆر ئاماده نیم له گه ڵ تۆ بم٠ نازانم چۆنت تێ گه یه نم ٠ نامه وێ خانم ! نامه وێ!

سه رۆکی دادگا قسه کانی بڕی :

–" کاکه به راستی ئێوه بیر ده که نه وه که ته ڵاق دواین په ڕی قوماری ژینه ؟ ئه ده ی پیاوه تی ، ژیری، لێ- بووردوویی و ئه مانه چ مانا - یه کیان ده توانێ هه بێ ؟ سه یره ! ژنێك که مێرده که ی خۆی ئاوا ئه ویندارانه خۆش ده وێ ، پیاوه که پشت له م به خته وه ری یه ده کات ؟ کاکی خۆشه ویست "ژن" دیاری یه که له لایه ن خود ا بۆ په ره پێدانی به ره کان و په ره پێدانی هاوسه نگی سروشت و هه ر پیاوێك پێویستی به ژن هه یه ٠ ئێستا که تۆ ژنێکی هێنده وریا و تێگه یشتووت وه ده ست که وتووه ٠ مه هێڵه وا به هاسانی له ده ستت بچێ ٠ چونکوو ژ ن " کووتاڵ " نیه ٠ " ژن" " به هره "یه ٠

وه ره جارێکی تر له روانگه ی دڵ ته ماشای دونیا وشاردراوه کانی که ٠ روانین له ڕێگای دڵه وه نه له ڕێگای چاو ٠

سه رۆکی دادگا ماوه یه ك بێ ده نگ بوو ٠ چاوه ڕوانی لێ خۆش بوونی من بوو ٠ به ڵام من پێشه کی ته ما ی خۆم گرتبوو : " ته ڵاق " ٠

سه رۆکی دادگا به ناهومێدی ته ماشای من و خێزانمی کرد ٠ ده تگوت ئه و زۆرتر له من به و جیابوونه وه له جه زره به دایه ٠

" توبا " بۆ دوایین جار دوایین هه واڵی خۆی دا و ده ستی به گریان کرد و وه ك منداڵێك که به گریانه وه قسه ده کا ، فرمێسکی له چا و ده هاته خوار و به و هیوایه که به ڵکوو به گریان کاره که ی راست بێ، ده ستی پێکرد :

–"ته هماسب " ٠٠٠ من له هه وه ڵه وه نه مده ویست له گه ڵ تۆ زه ماوه ند بکه م٠ نه تۆ ، هیچ پیاوی تریش ئاخر من ده مه ویست درێژه به خوێندنه که م بده م وببم به و که سه که ئاواتم بوو٠٠٠پزیشك ٠٠٠٠ خانم دوکتۆر٠٠٠ چ رۆژانێك که به م ئاواته وه بووم و چ شه وان که له دنیای خه ون دا ، خۆم به جل وبه رگی سپی دوکتۆری یه وه ده دی ٠ چه نێ خۆش بوو کاتێ ده متوانی نه خۆشێك له ده س ئێش و ئۆف رزگار که م ٠ به ڵام به هاتنی تۆ بۆ نێو ژینم ، هه موو شتێك ره نگێکی دی به خۆیه وه گرت ٠ له به رگی سپی و ئاواتی دوکتۆر بوون تا به رگی سپی وراسته کی زه ماوه ند ! ده بێ له بیرت مابێ که چۆن رازی به م زه ماوه نده بووم ؟! " خۆ کوشتن "، به لێ "خۆکوشتن "، تۆ ! ئه ویش له به ر من ٠ گوتبووت " ژین بێ توبا مانای نیه " گوتبووت ئه گه ر ئه وجاریش رزگاریت بێ ، جارێکی تر ده س بۆ خۆ کوشتن ده به یه وه ٠ ئه مه قسه یه ك بوو که به پزیشکی ده رمانکه رت گوتبوو ٠

من ٠٠٠ئه رێ ، من ٠٠٠٠ بۆ ئه وه ی جارێکی تر ژینت

پێ ببه خشم ، هاتمه ناو ژینت ٠ به لام به داخه وه تۆ ئێستا ده ته وێ ژین له من بستێنیه وه! ئایا ئه مه کارێکی عادلانه یه ته هماسب؟!

باوکی خوالێخۆشبووم به م زه ماوه نده رازی نه بوو٠ ده یگوت " پێم باش نیه زه ماوه ند له گه ڵ لاوێك بکه ی که توانای رووبه روو بوون له گه ڵ ته نگ و چه ڵه مه کانی ژیانی نیه، ده یگوت " خۆکوشتن ، بێ هێزی ویست وبڕوای که س ده گه یه نێ ٠" به لام کاتێك زانی که من قسه یه کم نیه ئه ویش قسه یه کی بۆ گوتن نه ما ٠ به دوای ئه ودا باوکم وه ك ماموٚستایه کی دڵسۆز ، ئاگای لێمان بوو ٠ باوکێکی روو خۆش ، له ئاکامی ژینی دا ، که ته واو ده بوو و له سه ره مه رگدا بوو ، ده ستی من و تۆی به ده ستی بێ تینی خۆی گرتبوو له وه ده چوو که چاوه ڕوانی هاتنی دوارۆژێکی هه بوو و منی به تۆ ده سپارد و هه ردووکمانی به خودا ده سپارد ٠ چی لێهات ئه و ئه وینه ی که له شه وی ساردی زستان دا به خوازبێنی یه ك بۆمنت ناردبوو ؟ چی لێهات ئه و ژینه ی بێ توبا ٠٠٠؟! ئێسته ئیتر قسه یه کم نیه و ته لاق قه بووڵ ده که م ٠ رۆژێکی تر ، له جێ یه کی تر ، له دادگایه کی تر ، سه ربه رز رووبه رووت راده وه ستم٠٠٠له دادگایه ك که دادستێن خودایه و ئیتر له وێ هیچ داوای لێ بوردنێك قه بووڵ ناکه م٠٠ ئه شێ ئه م به ڵگه ی ته لاقه به سه ر کارنامه ی کاره کانی تۆدا قورسایی بکا ٠

" توبا " ئیدی نه ده گریا به گوتنی ئه م قسانه هێندێك هێدی ببۆوه ٠ به لام ئه من هیچ وه لامێکم نه بوو ٠

به م جۆره ماوه ی ژینی ژن و مێردی من و توبا ته واو بوو ٠ ته نیا دوایین جار که پێکه وه بووبین ، ئه وکاته بوو که له سه ر پله کانی دادگا خوداحافیزیه کی تاڵی کرد و له نێو خه ڵکه که دا ، لێم ون بوو٠

له کاتێکدا چاوم به په روین که وت که له بیری ئه و رۆژه دا بووم که توبا به منی گوت :" ته هماسب ، راستی ئه گه ر منداڵمان بوو ، پێت خۆشه ناوی کوره که ت بنێی چی ؟"
منیش به پێکه نینه وه گوتم : " ئه ی فێڵه باز ، له کوێ وه ده زانی کوره ؟"
گوتی :" به دڵم داهاتووه

که کوڕه . کوڕێکی کاکۆل زێڕین ، "هیوا" .... ئه رێ ناوی کوڕه که مان ده نێین هیوا ؟ له به ر ئه وه که هیوا مزگێنی ژینه .... په روین خۆی رازاندبوو ه جوانتر له وه ی که بوو وه به رچاو ده هات .

چه پکه گوڵێکی پێ بوو ، داینا و کوتی :

-" ته هماسب ، توبات ده س به سه ر کرد ؟ رۆیی ؟ کوتم :

-" ئه رێ " په روین"ئه ورۆ هه موو شتێك ته واو بوو.... من ئێسته ته نیای ته نیام .

په روین به پێکه نینه وه کوتی:

-" ته هماسبی خۆشه ویستم، ئه م قسانه چین ؟ تۆ ته نیا نی ... له مه به ولاوه "ئێمه" ...من وتۆ رۆژانێکی به یه ــ که وه تێپه ڕ ده که ین . هه لبه ت به و پێ یه تۆش هه رچی زووتر ده بێ به لێنی یه که ت به جێ بێنی و گۆوه ندی بگێڕین .

به دڵ ته نگی یه وه گوتم :

-" جارێ په له مه که . من توبام له به ر تۆ ئاواره کرد . ئێستاش هێندێك مه ودام بده تا بیره وه ری ئه و رۆژه خۆشانه ی که له گه ڵ توبام بووه له بیر بچنه وه . نێوچاوانی لێ تێك نام و کوتی :

-" خۆشی ؟!کامه خۆشی ؟! تۆ هه مووکات ده تگوت که منت له توبا خۆشتر ده وێ و له به ر من ژنه که ت ته لاق ده ده ی ؟ منداڵیش بیانوویه ك بوو بۆ جووربوونی کاره که ت. چا بۆیه ده بێ زووتر ده س به کار بین و له مه زیاتریش ناتوانین به پێچه وانه ی ئوسوولی شه رعی که ین و به ینمان بێ ....

دوو سێ حه وتوو به م جۆره تێپه ر بوو که په روین به نێوی خێزانی من پێی نایه ناو ماڵێك که جێ ژینی رابوردووی توبا بوو .

رۆژه کان و حه وتووه کانی سه ره تای ژینی هاوبه شیما ن له گه ڵ خۆشی یه کی زۆر تێکه لاو بوو . به لام هێنده ی پێ نه چوو که بیانووه جۆڕاوجۆڕه کانی په روین ده ستی پێکرد و له چکۆله ترین شت ، کێوێکی بیانوو و داده تاشی .

په روین زۆر که لله ره ق و سه رکێش بوو . بایه خی بۆ قسه کانم دانه ده نا . ژینێکی پڕ خه رج ،هه رروژه ی ده ستێك جل وبه رگ ، پووڵ به م لا و به ولا دادان و.... ته نیا به شێك له کاره ناره واکانی په روین بوو . هه روه ها ته واوی که ل و په لی ماڵ که توبا له ماوه ی ژن و مێردیمان دا کۆی کردبۆوه ، بلاوی کرده وه و ئاسه واری نه هێشت .

منیش بوومه ئینسانێك که له ژێر باری قه رزو قۆڵه دا ماوه ته وه و بێزار له هه موو شتێك.که کاتێ ژینی ئێستای خۆم له گه ڵ ژیانی پێشووم هه ڵده سه نگاند ، خۆم نه ده به خشی و خۆم به تاوانبار ده زانی :" خۆ م کردوومه ، تازه ده رمانی چی"

ره وتی زه مان ، ژینێکی بۆ پێك هێنابووم ، پڕ له ژان و ئازار...

کار به جێ یه ك گه یشتبوو که رۆژێك په روین زۆر به رووداری یه وه پێی کوتم :

-" ئیتر پێم خۆش نیه ته نانه ت رۆژێکیش له لای پیاوێکی وه ك تۆ دانیشم ."

بۆ به راستی ده بێ ئه من چیم به سه ر هاتبێ و چیم لێ هاتبێ که ئه و پێی خۆش نه بێ له کن من دانیشێ ؟!

به لام په روین حازر به ته لاق وه رگرتنیش نه بوو و ده یگوت :

-" تۆ هه ر بۆوه ده بی که به ناو مێرد بی .....

ئاخ چه نێك جه زره به به رداره و چه نێك تاڵه بۆ پیاوێك که به نێو مێرد بێ ...

په روین رۆیشت ..هه روا که هاتبوو...ئه م ماره خۆش خه ت و خاڵه چۆن هاته ناو ژینم و چزی له توبا دا و ئه وی گه زت و له من هالا، رۆیشت.له گه ڵ ژینی من ، به ته واوی دونیای ره نگاوره ــ نگه وه که دروستم کربوو...

بەڵام تراویلکە یەک زیاتر
نەبوو . ئەو ئێستا جاری
وایە لەگەڵ پیاوێکی تری
وەک منە و جاری واشە
لەگەڵ یەکی ترە .

بەهار لە باوەشی
نەورۆزدا دەهات ... پێکەنینی
منداڵان دەهات و شادی لە
کۆڵان و شەقامەکانی
شاردا دەگەڕا ... جێژنانەیان
بە یەک دەدا ...

" جێژنی نەورۆز " و
" بەهار " دوو هاوڕێی لە
مێژینە ... وەرزی جێژن و
مرۆڤایەتی . بەڵام جێژن
بۆ من مانایەکی نەبوو ...
ببوومە پیاوێک کە تا نیوە
شەو لە کۆڵان و شەقامەکانی
شاردا بە هیوای دۆزینەوەی
پەروین دەخولامەوە . گەرە -
کم بوو تۆڵەی ئەو
بەختەوەری یەی لە منی
ئەستاندبوو ، بستێنمەوە ،
گەرەکم بوو ... بەڵام لە
دەروونی خۆمدا هەستێکی
زۆرم بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە
نەبوو ، پێم وابوو هەست
بە تۆڵە ستاندنەوە کارێکی
چکۆلەیە . جووتە لاوەکانم
دەدیت کە چۆن لە پەنای
یەک دانیشتوون و دونیایەکیان
هیوا دروست کردووە وهیواداری
پاشەڕۆژن ....

ڕۆژی هەینی بوو.هەینی
یەکەمین ساڵی نوێ .
شەقامەکانی شار لە
ڕابردوو چۆڵ تر ببوون و
ئەوانەش کە لە هاتوچۆ
دابوون ، " جێژن "یان بە
میوانی بۆ یەک دەبرد .
منیش لە شەقامەکانی
شاردا دەگەڕام ... بێ ئامانج
بێ بەش لە بەختەوەری ...

لە نەکاو دیمەنێکی
سەیرم وە بەرچاو کەوت .
وامزانی خەیاڵاتە ، گیانم
لەرزی ، لەشم لەرزی ...
بەڵام ئەوە ڕاستی بوو ،
تراویلکە نەبوو. ڕاستە -
قینەیەکی تاڵ بوو کە
بە چاوی خۆم دەدی ... توبا ..
بەڵێ توبا ... توبام چاو
پێ کەوت ،لەگەڵ کوڕێکی
لاو و منداڵێک بە باوەشەوە.
ئەم پیاوو منداڵە دەبێ چ
خزمایەتێکیان لەگەڵ توبا
هەبێ ؟ دەبوو تێگەیشتبام.
لە ماوەیەکی کورتدا کە
توبا بۆ کڕین چووە ناو
فرۆشگایەک ، بە دەرفەتم
زانی و خۆم گەیاندە لای
پیاوە لاوەکە ... چ کوڕێکی
جوان . چاوەکانی بە ڕەنگی
ئاسمان ، واقی منداڵەکە
بووم کە دەنگی پیاوە لاوەکە
وەخۆی هێنامەوە :
-" ئاهای کاکە ، بڕۆ
ئەو لاوە ... بۆوا واقی ئەم
منداڵە بووی ؟!
بە زۆر قسەم بۆ دەهات :
-" من ... هیچ یەک .....
هیچ یەک ، ئەمە کوڕی
ئێوەیە ؟!
پیاوی لاو بە سەرسوڕماوی یەوە
گوتی :
-" ڕوونە کە کوڕی منە
بۆ دەپرسی ؟
گوتم :
-" کوڕێکی جوانە کاکە
ناوی ... ناوی ئەم کوڕەی
ئێوە چییە ؟
پیاوی لاو کە زۆرتر سەری
سوڕمابوو گوتی :
-" هیوا ... ئیتر پرسیار -
ێکی دیتان ماوە ؟
گوتم :
-" ناوێکی جوانە .....
هیوا . ڕۆژێک ژنێک بە منی
گوت " هیوا " مزگێنی ژینە .
لەم کاتەدا ، " هیوا "
قاوی* دایکی کرد و پیاوی
لاو گوتی :
-" دەبینی ئەم دوو
بستی یە چ دایکە دایکێکێتی ؟
وەکوو شتێک دەڵێی لە
دەستی هەڵدێ .
لە کاتێکدا ماڵئاواییم
لەگەڵ دەکرد گوتم :
-" بەختەوەر بن کاکە ."
پیاوی لاو وەڵامی دامەوە:
-" لە بەختەوەریدا ،
هیچ شتێکمان کەم نییە ؟

سەید عەولّا سەمەدی

دەقی بەیتی هەمزاغای مەنگور:

خالق هەر ئەتۆی لەسەر
رەببی هەر ئەتۆی لەسەر
چی تۆ پێت بێ ئیرادە
رانابرن هیچ موقەددەر

سێ موقەدەرن بەسەر دێن
مردن و گوشتن و گرانی
لە موکوریان دوو حێل بوون
بەگزادە (٤٣) قارەمانی (٤٤)
یەکێك بوو لە بەگزادان
حەیفێ بۆ "عەلی خان"ی
بانگی خانبابای بکەن

لە (ئە)حمەد بەگی وەگێرن
قادرئاغا (٤٥) پێ بزانی
ئەو دەبیرێکی چاکە
گەورەی دێبۆکریانی
کاغەزێکن بۆ بنووسی
خزمەت پادشای ئێرانی

حاکمێکن بۆ بەرێ کا
چاك بێ، پێ بە هەرزانی
پادشا تەگبیری دەکرد
شازادێکی (٤٦) بانگ دەکرد
زۆر چاکی نسحەت دەکرد

٤٣) حاج سیاح کە لە شعبانی ١٢٩٩ ی کۆچی(= مە ١٨٨٢) هاتۆتە سابلاغ لە بیرەوەریەکانی خۆیدادەنووسێ " سۆراغی وەزیری فواید( = امیرنظام گروسی)م گرت، گوتیان چۆتە ورمێ لای **ئەمیرتیزام عەلائودەولە** چونکە گۆیا شێخ عوبەیدوڵلا دیسان هاتووە بۆلای سنوور، ئەو دەم "**خوسرەوخان**"ی برای وەزیر بە ئەمانەت حوکمرانی سابلاغێ بوو." هەڵبەت هاتنەوە لای سنووری شێخ لە ساڵی ١٨٨٢ دا دەبێ دوای راکردنی ئەو لە زیندان بووبێ.
٤٣) بروانە پەراوێزی ١٨.
٤٤) لە عەشیرەتی دێبۆکرین. بۆیە وایان پێ دەڵێن چونکە لە ئەولادانی " قارەمان" ناو لە کوڕەکانی " بەیرەم ئاغا"ی دێبۆکرین.
٤٥) بروانە پەراوێزی ٩.     ٤٦) بروانە پەراوێزی ٨.

بەو دیارە* و زەمزەمە
بۆ سابلاغێی بەرێ کرد
دەبڕۆ و رامەمێنە
خەڵکی تەفرەقە مەکە
مەخلووقی مەتۆقێنە
دەسەر ئاغاوەتان کە
حەمباراتان بشکێنە
بە قەتار و بە باران
لە بۆ سابلاغێی بێنە

حاکم هات و وای نەکرد
دەس بە بێ نامووسی کرد
پیاوێکی وسێن ئاغای گرت
ئەو بێ سووچ لووتی کون کرد
وسێن ئاغا مودەبیر بوو
زۆر چاکی خزمەت دەکرد
کە چۆوە بۆ ماڵە خۆی
لە حەیفی ئەو قسەی دەمرد
لە (ئە) غاوەتیان بوو غولوو
را و بێ رایان دەکرد
گەر ئەمە هەمزاغای نەگرین
ئەو وەلاتی خەرا کرد
هەمزە مەردی کارخانێ (٤٧)
هیچ بەو کارەی نازانێ
بە خۆ و بە قلیانداری*
دەهات لە بۆ دیوانێ

لە خواجا* بیداریان دا
حاکم چۆ باڵەخانێ
خڕڕەی زنجیران دەهات
فەراش گەینە پێشخانێ
کاک هەمزە تۆماچی کە
موقەسیری دیوانێ
دەلاقت دەکەم کۆتێ
دەملت دەکەم زەولانێ (٤٨)
لیرەشت لێ ناگەڕێم
دەتنێرم بۆ تارانێ
لەو هەمزاغای جووت غیرەت*
دەستی برد بۆ خەنجەرێ
هەڵدەکێشی دەبانێ*
بە زەبرینگان* لێی دەدان
زیرەی برد بۆ عاسمانێ
تەقەتەقی مارتینان*
لە بڵەسەی دەشخانان
چرپان چرپان* پەیدا بوو
لە کووچە و لە دالانان

هەمزاغا دەنەڕێنێ
دەتفەنگم لە بۆ بێنن
دەزرێ و دەمەرقوپانێ*
دەئەسپم لە بۆ بێنن
مەتاڵ و حەیزەرانێ (٥٠)
بەگەل وەدەر دەکەوتن

---

٤٧) پیاوی لێهاتوو، ساحیبی کاری گەورە و گران.
**کافر وەستان لە سانێ**
**محەممەد پێ بزانێ**
**تێمان دەخا قرانێ**
**لێمان نادا وچانێ**
**لە بری مەردی کارخانێ** -بەیتی حەتەم-لە زاری مینەی مرادی

٤٨)" زاولانە، زولانە : بەندێکی ئاسنە کە لە مل یا دەست و لاقی زیندانی دەکەن، حەڵقە و زنجیرێکە ئەسپ و یەستری پی سندم دەکەن" - فەرهەنگی عەمید -
**ئەگەر هات گمیە دیوەخانێ**
**ئەسپی بەرنە ئێختەخانێ**
**وەملی کەن کوت و زەولانێ** -بەیتی قوچ عوسمان-تحفەء مظفریە، ل ٦٣٢

٤٩) تفەنگی Marttini - Henrys

٥٠) هەمان "خێزران" ە و لێرەدا مەبەست لە رمب و نێزەیە. خێزران جۆرە قامیشێکی راست و بڵندەکە تاکوو بیست مێتریش بەرز دەبێتەوە. Bamboo

کادەرۆیشی[٥١] کوێستانێ
دەچوون بۆ باغی قیبلەی[٥٢]
لەوێ دەدران لە سانێ
هەمزاغا ئەساوڕی داوە
حەمەد و سلێمان کوانێ
حەیفێ لەبۆ حەمەدی
کوژراوە مەردی مەیدانێ
سێ تەلاقەی فڕێ دەدان
بە سی جزمەی قورعانێ
لێرەشی لێ ناگەڕێم
دەیماڵم تا تارانێ

گۆنە خوێنم وەبیر دێن
وێ ساڵی سەربڕانێ
دەبێ بچمە نەهیریەی*
بە سەنەد شێخی بێنم
لە بۆ عەجەم قڕانێ
ئەو دەمەی دەچۆ نەهەرەی
دەگەڵ وەردووی شێخی* هات
ئەو دەمەی شنۆی دەگرت
لە مامەشان بۆ غوڵوو*
را - و بێ* رایان دەکرد
حەمەد ئاغا سوار دەبوو

دەهات لە بۆ سابڵاغێ
پرسی بە حاکمی دەکرد

ماشەڵلا چەن (د) نادرم
بە تیپ و بە لەشکرم
پیاوێکی ساحەب نێوم
بە بێ ئەجەل نامرم
دەستم دەگەڵ بدەنێ*
ئەز رێیەی لێ دەگرم

مەجلیسی دا هەڵدایە
بەگزادە و قارەمانی
گەر ئەمە لەشکری بکەین
وەك دەوری نۆشیروانی
دەڵێن شێخی دەگەڵە
پاك تەلاقن دەکەوێ*
دەمرین بە بێ ئیمانی

حەمەد ئاغا سوار دەبوو
قەرەپاپاغی[٥٣] گاز کرد
دەگەڵ وەردوی شێخی هات
تاجران خۆیان خەلاس کرد

لە هەمووی هەڵات هەڵات
وەخڕ بوو هەزار ملەت

---

٥١) کادەروێشی، مەبەست لە مەنگوڕەکانە، چونکە گۆیا بنەچەکەی مەنگوڕان دەچێتەوە سەر "کادەروێش" ناوێك.

٥٢) هەڵکەوتوو لە باشووری رۆژئاوایی شاری سابلاغ. واتە جێی پادگانی ئێستا.

** ئاشێرە بە کوژرانی باپیراغای مەنگوڕ و سوارەکانی یەتی کە بە پیلانێکی ناجوامێرانە هەموو لە شەوێك ناپیاوانە لە مەراغەدا سەریان بڕین و دوای ئەو مەنگوڕ بوون بە مێ وەجاغی.

**٥٣)** یانی کڵاورەش، چونکە لە پێستی بەرخ کڵاوی رەشیان لەسەر دەنا ئەو ناوەیان بەسەر دابرا. بەر لەو ناوە عەشیرەتی **"بوزچلو"** یان پێ دەگوتن، چونکە دانیشتووی ناوچەیەکی ئەراك و هەمەدان بوون. کە ناوی ناوچەکە "بوزچلو" بوو. چونکە ئەم تایفە بوێر و شەڕکەر بوون شاکانی سەفەوی لە جێی خۆ هەڵیان کەندن و بۆ راگرتنی گرجستان و بەربەرەکانی لەگەڵ تایفە غەوارەکانی ئەو دەور و بەرە هێنایاننە گرجستان و نزیکەی دووسەد ساڵ لەوێ مانەوە.

تاکوو خولی هەوەڵی شەڕەکانی ئێران و رووس دەستی پێ کرد و ئێران شکا و بەپێی پەیمانی (گوڵستان) گرجستان بوو بە هی رووسیە، قەرە پەپاغەکان کە بۆ پاراستنی گرجستان لە ماڵ و هێلانەی خۆیان ئاوارە کرابوون ئیدی کارێکیان نەما و نەشیاندەویست لە ئێران هەڵبڕێن. ناچار زەوی و زاری خۆیان جێ هێشت و هاتنە ئەو دیوەی سنووری نوێ. تاکوو خولی دووهەمی شەڕەکانی ئێران و رووس دەستی پێ کرد و دیسان ئێران شکا و بە پێی پەیمانی (تورکمانچای) سنوور تەنگتر بۆوە و قەرەپەپاغەکان بە بێ ئەوەی لەجێی خۆیان بزوون کەوتنە خاکی رووسیە. ناچار بۆ جاری دووهەم بارگە و بنەیان تێك نا و هاتنەوە ئێران. ئەو دەم "سندووس" بە ملکی هی عباس میرزای **نایبطسه لتنه** بوو. عەباس میرزا لەساڵی ١٢٤٥ ی کۆچی ( = **١٨٢٩**) قەرەپەپاغەکانی لە سندووس نیشتەجێ کرد و ئەو مەڵبەندەی بەوان بەخشی. قەرەپەپاغەکان خۆیان سوننی و شافیعی مەزەبن بەڵام سەرۆکەکانیان لەسەر مەزەبی "شیعەی ائنی عەشەری" ن - سرزمین زردشت - ل ٦٢

"خرنال"ه بەیتی دەکات
ئەگەر حاکم وای زانی
هیچ کەس لە سەری ناکات
دەس بەجێ حاکم هەڵات

با بدەین دەنگی لەشکری
دەبا بێن "رەمک" و "پیران"
"زەرزە" بێن بە نادری
"مەنگوڕ" و "مامەش" و "پیران"
"گەورك" بێنە لەشکری
حێلی" فەیزوڵڵا بەگی
"بەگزادە" و "دێبۆکری"
ئەوها دەڵێ کاك هەمزە
پاك* کاغەزم بدەنێ

سەبەب بە سبحەی رۆژێ
کەس خەتای کەس نەگرێ
شێخ داوای مۆڵکی دەکا
تا تەورێزی دەگرێ
تا تەورێزم ئی وییە
یەکیك وا لە شارییە
ئەو برای تاجر باشییە
حوجرەی نەکرد خۆراییە
دەڵێ ئەو ئالایەی بە شێخییە
سابلاغیان دروست کردییە

لە لرفە لرفی ئالایە
تەماحە ماڵی دنیایە
زۆر بترسێن لە دوایە
پێن وەگیرێن ئەو قەزایە*
هەمزاغا سوار دەبوو

دەنۆکەران دەفکری*
دەکورە بدەن لە تەپڵی
دەگەڵ سبحەینێ تاو دەنگووت*
دەورەی میاندواوێ دەگری
هەمزاغا دەنەڕڕێنی
سلیم خانی چەر داور و
وەك پۆڕێ(۵۴) دەچریکێنی
دەگەڵ تفەنگی دەیهاویشت
لە خاڵی شێخی دەدا
لە زینی دەترازێنی*
وەك جەلاب* دەبرێ سەری
وەك هەڵۆی دەرفێنی

فەسڵێکی وا قەڵماوە
هەندێك لە پیاوی شێخی
کاڵەمونی" یان(۵۵) ناوە
جوابیان دێنا بۆ شێخی
یا شێخ خاڵت گوژراوە

شێخ ئەوە گوێی خۆی لێیە
پیاوێکی خوێندەوارە
هەم مەلایە و فەقێیە
دەبڕۆن لەو قسەی گەڕێن
چبکەم کاری خودێیە
دەبڕۆن! رەدوای* کەون
بزانن مەنزڵی لەکوێیە
ئاوری بەردەنە شاری
بێت بە رۆژی حەشرێیە
تەقەتەقی مارتینان

---

۵۴) ناوی باڵندەیەکە، کە لە ئوروپا دا لە جەزیرەی سیسیل و لە ئێران دا لە "جیرفت"ی کرمان و "ئەستراباد" و "دەشتی مۆغان" و "باشووری ئێران" و هەروەها لە "رۆژئاوای ئێران بەتایبەت لە کوردستان دەست دەکەوێ. بە کوردی: "زرەکەو، زیوەکەو، پوور، و بە فارسی "پور، تراج، کبك کر، جرب، هندێکیش(مرغ حسین کشته شد)ی پێ دەڵێن. و بە عەرەبی "دراج و حیقطان"ە Francolin

**ڕەنگ ڕەنگ پەپولە ئەفری زەلا و زەل**
**گاکناچەی پۆڕ،گا جریوەی مەل** - گۆران- گەشت لە قەرەداغ

۵۵) دروستەکەی "کالە موینە"یە، بەمانای "کالە"یەکی کە لە مووی بزن دروست کرابێ. لەناو کوردان دا زۆرتر کاڵە لە چەرم ساز کراوە جگە لە بادینییەکان کە جۆرە کاڵەیەکیان دروست دەکرد لە موو، بەتایبەت بارزانییەکان، جا سەبارەت بەوە "کالە موینە" یان پێ دەگوتن.

**کاڵەی مووین هەڵدەبەستێ**
**کێ هەیە ئەو پێی نەوەستێ** - هەژار- بۆ کوردستان

له بلّه‌سه‌ی ده‌شه‌شخانان
چرپان چرپان په‌یدا بوو
له کووچه و له دالّانان
مندالّ و خیّزان قوورین (٥٦)
ده‌په‌رینه سه‌ربانان
چه‌ندیان عه‌جه‌م ده‌کوشتن
له‌سه‌ر باغ و بیّستانان
ده ده‌ریّنن کلیلان
ده بشکیّنن دووکانان
ئه‌تلّه‌س و کیمخوا (٥٧) و خارا
بۆ گاوان و شوانان

بۆ گاوان و شوانی
له‌و حه‌مه‌د ئاغای مامه‌ش
چه‌ن پیاویکی زۆر زانی
ده‌گه‌لّ عه‌جه‌مان ییّکه
به مه‌نگوڕان غه‌یانی
لای بناویّ لیّ ده‌گرتن
به‌ری به‌ره‌ڵلا کردن
خه‌لّاسی کردنی کرمانی (٥٨)
میاندواویش تالّان ده‌کرا
ده‌گه‌لّ به‌ری به‌یانی

ئه‌و تالّان و مالّی هات
پاکی تاقه‌ت کراوه
یه‌کیّک له دیّبۆکریان
مینه‌ی قادراغای (٥٩) ناوه
له بنه‌بنه‌ی سه‌هه‌ندی
تالّان و مالّ گیّراوه

به‌وه‌ش رازی نه‌ده‌بوو
به‌و حه‌رابه‌ی کیّشاوه
نایب و موده‌بیران
له تیّلگرافیستان داوه

سه‌لام له شای ئیّرانیّ
خه‌راپن لیّ قه‌لّماوه
ئه‌و ره‌ژی فرۆشی گه‌ورکی
پاکی هاتۆ له‌و لاوه
ئه‌و سه‌رده‌شتی وا دیوته
مالّ به مالّی سووتاوه
ئه‌و عه‌جه‌می میاندواویّ
به سیّک به‌ریش نه‌ماوه (٦٠)

شا ده‌لّیّ: ئه‌وا* ناکه‌م
به قسه‌ی (ئه) نگو بڕوا ناکه‌م
ولّاتی خۆم خه‌را ناکه‌م

له‌و شیّخه‌که‌ی چاومه‌سته
سبحه‌ینیّ له خه‌و هه‌ستا
له‌و شیّخه‌که‌ی ده‌چاومه‌ست
که تفه‌نگی گرتبوو به‌ده‌ست
بانگی هه‌مزه‌ی کرد له‌قه‌ست

هه‌مزه بلّندبوو له ناویّ
له بریقه‌ی زریه و قه‌تلّاویّ (٦١)
ئه‌وچه‌ل ده‌چمه سه‌ر بناوی

هه‌مزاغا سوار ده‌بوو
سواره‌ی برازای که‌وته دو و
هه‌مزه ده‌لّیّ برازا
ده‌مانچه‌ی پشتیّم سازه
لیّی ده‌راوه به‌رازه

هه‌مزاغا خۆ ده‌خیّوی*
سه‌رتاپه خۆی ده‌بزیّوی
رمبی لیّ کردون به‌گه‌ز
خارا و کیمخوا ده‌پیّوی

* * *

دریّژه‌ی هه‌یه

---

٥٦) قووراندن
موغبه‌ت له‌وێ ده‌رپه‌ڕی
وه‌ک گورگی له نیّو مه‌ڕی
وه‌ک که‌ره‌نای ده‌زه‌ڕی
وه‌ک مانگایه ده‌قووڕی - به‌یتی حه‌تم - له زاری مینه‌ی مرادی

پاشماوه‌ی په‌راویّز له لاپه‌ڕه‌ی ٤٥

عومەر فارووقی

# حاجی میرزا عەولا غەرقی

مەڵبەندی شاخاوی و سەرسەوزی سەقز بە درێژایی مێژووی پڕ لە شانازی خۆی پەروەردگای شاعیران و هەستیارانی گەورە و ناودار و خواناسی کوردستان بووە و ئەم ناوچە جوان و پڕ گوڵ و مێرگ و هەوارگە و کەند و تەلانە وەکوو ناوەندی یەکتاپەرستی ونیشتمانپە — روەری بۆتە هێلانەی دەیان بولبولی خۆش ئاواز کە بە کەلام و نووسینی دڵڕفێن و جوانی خۆیان باغی ژیانیان رازاندۆتەوە و خزمەتی فەرهەنگ و ئەدەب وئایینی خۆیان کردووە ·

یەکێ لەو شاعیر و هەستیارە گەورانەی شاری سەقز کە بەداخەوە بە هۆی ناکۆکی ژیانی سەردەمی خۆی ئاوارە و پەڕیوەی دوور وڵات بووە خوالێخۆشبوو و " حاجی میرزا عەولای غەرقی سەقزی یە " ·

عەولا کوری حاجی حەبیب ساڵی ١٢٩٩ی کۆچی مانگی لە شاری سەقز هاتۆتە جیهان و بەداب و یاسای کۆمەڵ نێردراوەتە حوجرەی فەقێیان و دەستی بە خوێندن کردووە و پاش تەواوکردنی دەرس بۆ هەڵسووڕانی کاروباری ژیانی خۆی و بنەماڵەی بوو بە خەیات وتا ساڵی ١٣٠٨ ی هەتاوی کە حکوومەتی رەزا خان بە پێی بڕیاری خۆی جل وبەرگی نەتەوایەتی لەبەر خەڵکی ئێران دەرهێنا و شەپکە و جل و بەرگی فەرەنگی کردە لیباسی هەموو خەڵکی ئێران · مەرحوومی غەرقی بەدیتنی ئەم کارەساتە سەبرو قەراری لێ بڕا و لەبەر ئەوەی سەر بۆ ئەم

کارە ساتە نالە یارە دانە خا
و جل و بە رگی نە تە وایە تی
خۆی بە زۆر نە دا بە دە ستی
ئە منیە و ژاندارمە کانی
رە زا خان ، سە قزی بە جێ
هێشت و بە رە و شاری قارە ما-
نپە روە ری سولە یمانی لە
کوردستانی ئە ودیو چوو و
هە ر لە و شارە دووکانی
خە یاتی دانا و سە رئە نجام
لە تە مە نی هە شتاو یە ك
ساڵیدا هە ر لە شاری
سولە یمانی کۆچی دوایی
کرد و لە گۆڕستانی گرد ی
" سە یوان " کە بۆتە
لانکە ی ئاخیرە تی سە دان
زانا و پسپۆڕ و شاعیری کورد
نێژراوە ·

خوالێخۆشبوو میرزا
عە ولای غە ڕقی بە هە ر دو و
زمانی فارسی وکوردی شێعری
داناوە و لە ماوە ی ژیانی
خۆیدا بە وێنە ی شاعیرێکی
بە هە ست و نیشتمانپە روە ر
لە گە ڵ چاپە مە نیە کان و
گۆڤارە کوردی یە کانی
سولە یمانیدا هاوکاری
کردووە و شێعرە کانی لە چاپ
داوە ·

لە کۆتایی ئە م باسە دا
هاوڕێ لە گە ڵ ڕێز و سڵاو
بۆ رووحی پاکی ئە و هە ستیا-
رە تێکوشە رە شێعرێکی ئە و
کە لە کاتی خۆیدا لە
گۆڤاری هە تاودا چاپ کراو ە
پێشکە ش دە کە ین ، دیارە ئەم
شێعرە یە کجار بە رز وسە رنج
راکێشە و ئاکامی ژیان بە
جوانی پێشان ئە دا کە هیچ
لە م دونیادا بە کار نایە
مە گە ر ئیمان و باوە ڕ و بڕوا
و رە حمی یە زدانی بێ هاوتا·

قە ترە قە ترە ئارە قی خجلّە ت بە رووما هاتە خوار
ئینتیزاری مورغی رووحم کە ی لە قالب دێتە خوار

ئە شکی چاوم جۆشی هێنا ، نە وعی سێڵاو ی بە هار
سی و دوو گە وهە ر کە مە شهوورن لە نێو دە مدا بە دیان

لە شکری غە م وا هوجوومی کردە سە ر قە لعەی دلّم
یە ك بە گاز و یە ك بە بێ گاز، دە رچوون لە نێو دە م جار بە جار

شاهی شادیم قووە تی دە فعی نە ما ، کردی فیرار
لە ززە تی خواردن نە ما بۆم ، سوستی ئە عزا هاتە پێش

غە م لە کن عالە م هە میشە خۆ نیە ، ئیللا لە کن
بێ کە س و بێ قووە ماوم، دلّ حە زین و کە فتە کار

ئە منی بە د بە خت هێندە زۆرە ، نایە تە عیدە و شومار
کوڕ بە من چی ، کچ بە من چی ، ئە قرە با و خزم و برا

میحنە ت و دە رد و ئە لە م هێند زۆرە باسی ناکرێ
هیچ کە س نایێ بلّێ پێم ، چۆنە حالّت دە ردە دار

بە حسی دە ردی خۆم بکە م، بۆم دێنە گریان زاری زار
یارە بی هە رچی ئە مانە ت بوو هە مووت لێ سە ندمە وە

نووری چاو تاریك و گوێ کە ڕبوون، نە ما قووە ی سە ماع
بۆ حە ساب بکە بە خاتر رووحی پاکی هە شت و چوار

دە س بە گۆچان و عە سا ، بۆ هات و چوونی ژوور و خوار
غە رقی ئومێدی نیە ئیللا بە عە فووی زولجە لال

دە ردی پشت ، ئێشانی ئە ژنۆ ، عیجزی مل ، زە عفی بە دەن
" رَبِّی فَاغْفِرْلِی ذنوبِی نَجِّنِی مِنْ حَرِّ نارْ "

# تۆف و بەند

"سۆران" حەسەن سەلاح ●

بەیانی رۆژیکی نیّوە راست مانگی زستان بوو، ئەگە ر تفت هەلّهاویشتایە دەیبەست، ئاشەوانی مەزنی سوروشت لە کەویژی خڕی ئاشی گەردوونەوە بەفر و کەرەسیسەی دەبیّژا خوارەوە ، دە.تگۆت زستانی پیر لە داخی لە دە ست چوونی سە ردەمی دلّگەشیّنی لاوی ، لە ئاسمانی تنووکە*وە فرمیّسکی بەفرین دەڕژیّنیّ و هیّندەی ئەسرینی سپی لە چاو هاتبوو ، کە ردیّن و بەر پیّی وەك چۆڕی شیر سپی ببوو، هەر لەم کاتەش دا ، سوروشتە پیرە چاوی بەم ردیّنە سپیەی خۆی دەکەوت و پتر کولّی گریانی هەلّدەستا و سەری بە هەنیسکی بادەوەوە، هەلّدەکەندرا و بڕبەندی باڕن وەها جیها نی سپیلکەی ریّك و پیّك و ساف و لووس کردبوو ، کە هەتا چاو هەتەرەی دەکرد ، دەور و بەری دیێ "کیّوە رە ش" لە حێ خیّلی پەریان دەچوو٠

رەشە بای ملهوڕ خونکاری شەقام و دارۆغەی کۆلانەکان بوو و بە هاژەی بێ و چا نی، پەیتاپەیتا زەنگی بیّدەنگی لیّ دەدا و هەر کەس وەك ماستی مەیو گوێی بۆ شل نەکردا یە ، وەها بە قەمچی تیژ ی کزەی خۆی لەشی دارکاری دەکرد ، کە پیّستی ئەندامی وەك بیبار دەیسو*لاندەوە ٠

ئاشیّکی ئاوی کۆن ، لەو بەر شیواوە خونچیلانەکەی تەنیشت ئاوایی بوو، کە لە نیّو تاریکی کڕیّوە و بۆران دا وەها نوقم ببوو کە دەتکوت چاوشارۆکی دە کا ٠ سەر دۆلانی ئاشەکە وەها بەستبووی،کە چۆڕاوەی ئاوی دویّنیّ نیّوەرۆ، چەشنی شمشیر و نیّزەی جۆر بە جۆر ، جەرگ*دابو و لە دووررا لە چەکی بلوورین دەچوون زەمورەك٭،چەقەنە و تەوەرەی ئاشەکە ،گشتیان بە تۆرموزی سەهۆلیّنی مام شەختە رەق راوەستا بوون و بیّجگە لە تینی بە تینی خوشکە هەتاو ، هیچ هیّزیّ نەیدە توانی دەستو پیّیان بکاتەوە ، کە ئەویش لە پشت چارشیّوی فا*ی سپی هەورە وە ، بە شەرمەوە وەها خۆی شاردبۆ وە ، کە هەستو خوستی نەبوو ، دەتگوت بە هار خوازبیّنی کەریەتی و خەلّکی دیێ کیّوەرەش ی ناردو ە تە کن سوروشت، کە لە جەژنی نەورۆزدا لە گەلّ هەتاو شایی بکەن ٠

چۆمە پەنگە جوانەکەی بە ر دەمی دیّ ، کە لە بەهار دا بەکووزەلّەی ساوا و پنگەی شەو نویّن وەکوو بووك رازا بۆ وە و زۆر جار بە تەوسەوە پیّیان دەگوت " چۆمە زیّڕینە " ، وەهای جەردابوو و خسۆی شاردبۆ وە ، کە هیچ کەس نەیدەتوانی لە کویّیە ، جاری وا بوو دەمگوت لە ترسی تۆف و بەند لە سەر تەختی خیزەلانی لە میّژینەی خۆی نووستوە و لیّفەی ئەستوور و گەرمی سپی بەفری بە سەر خۆی دا داوە و رووبەرگی سەهۆلیّشی بە سەر کیّشاوە ٠ لە بیرمە ، کە چەند جار کاك نەبەزی جیرا نمان ، بە سواری ئەسپە رەش ، بە پڕتاو بە سەریدا تێ پەڕی ، بە لام هیّندە لیّفەکە ئەستووربوو و ئەوەندە خەوی خۆش بوو، کە تەنانەت جوولّەی نەهات ٠

پەلەوەرەکان هەموویان کەسیر*ە کەوتبوون لە ژیّر قەمچی تۆفانی شەختەدا ، جگە لە بالّ و پەڕی خۆیان ، دالّدە و پەنایەکی دیکەیان نەبوو ، لە بەر ئەمە وەها خۆیان کۆ کردبۆ وە و پەنایان بۆ لەشی خۆیان بردیوو ، کە گرژ ببوون دەتگوت چوونە تە نیّو زگی خۆیانەوە ٠ لە گەل ئەمەش دا مندالّی قۆشمەی دیێ کیّوە رەش تەپکەیان لی دەنانەوە٠

تەنزی کۆمەڵایەتی

# هەزارتمەن!!

**هەمەوەند**

ت ازەگەیشتبوومەوە ئیدارە وپەروەندە یەکم کردبۆوە کە کاری لە سەربکەم و دووسێ ئیرادی چکۆڵەی لێ بگرم وشەش حەوت مانگی دیکەی وەدواخەم کە لە نەکاو هەمەوەندی هاوکارم بەهەرە* مە وەژوورکەوت وبە خۆشحاڵیەکی چاوەڕوان نەکراوە وەگوتی :

- کاکە باس مزگێنی!مزگێنی !

جارێ ئەم پەروەندەیە لابە و گوێ بدە من. نازانی چم کردووە! نان!ئاو! ناوبانگ!پوول!ڕێز و حورمەت! هەمووم دەستخستووە! ئەگەر هاوکاریم بکەی بەشی تۆشی تێدایە!

ئەوە یەکەم جار نە بوو کە ئەو تەرزە قسانەم لێ دەبیست بێ ئەوەی سەرهەڵبڕم گوتم:

- لێم گەڕێ کاری موسوڵمانان ئەنجام بدەم. کابرا سبەینێ دێ یەخەم دەگرێ و پەروەندکەی دەوێ .

ئەوەندەم دی خۆی گەیاندە میزەکەم وپەروەندەی لەبەردەستم فڕاند وتووڕی هەڵدا نێو سەتڵی ئەشغاڵ و تێم ڕاخوڕی .

- ئاخر مەردی حیسابی سی ساڵە خەریکی ئەوکارەی چت بە چ کرد؟ بۆئەومێشکە رزیوەت دەکارناکەی و فکرێکی بۆخۆت وماڵ و منداڵت ناکەیەوە؟.

خەریك بوو زۆری درێژە پێبدا ناچار سەرم هەڵبڕی و گوتم :

- دیسان چ خەبەرە،دیسان خەونی خۆشت دیوە؟ چەندت پێ بلێم شەوانە کەم بخۆ!

بە مۆڕەوە گوتی :

- خەونی چی ؟ خەیاڵی چی . ڕاستی ڕاستە، وهیچ شکت نەبێ !

- باشە چ قەوماوە؟ تۆدۆینێ دەگریای و دەتگوت سەگ ونان قەرزداری وهیچ دەراوی ڕوون شك نابەی . چۆنە والە نەکاو بە پوول وسامان وناوبانگ وڕێز و حورمەت گەیشتی. چۆن بە شەوێك بوویە ڕاکفلێر؟

- کاکە گیان بە فکر» بەعەقڵ، تۆپێت وایە ئەوانەی لە من و تۆ پێش دەکەون چیان لە ئێمە زیاترە؟ ها؟ هیچ! تەنیا ئەوەندەیە ئەوان بە عەقڵ و فکر کاردەکەن و دە ژیاندا سەر دەکەون، من وتۆش دەی بنووسە : عەتف بە نامەی ژمارە .... دەی بنووسە پەیڕەوی نامەی ژمارە فلان. هەرلە جێی خۆمانین وبەشمان هەردوو نانەکە یە و کاسە دۆیەکە. بەو میزە شکاوەوە نووساوین. مێشکمان دە نێو کەشەوەکەی دایە و بێجگە لەم میزو لەم وەتاغە هیچ جێگایەك نابینین.

- نەخێر دیسان بوو بە فەلسەفەو سەفسەتە! لە سەری مەڕۆ بلێ بزانم چۆن بە شەوێك بوویە قارون؟!

- بە کتێب نووسین !

خۆم پێ ڕانەگیرا .قاقایەکەم بە سەر داکێشا کە دەنگی گەیشتە کووچە! ئەو پێکەنینەی کە تێکەڵاوێکە لە تووڕەیی و شێتی ومەسخەرە کردن. ناحەقم نەبوو. ئاخرکام کتێب نووس ونووسەرانی شەویان هەیە تا هەمەوەندی گێل وحۆل پێی دەوڵەمەند بێ وبە نان وئاو بگا! هەروا کە پێدەکەنیم ئەو فکرانەشم بەزەینیدارادەبرد.

پاش ئەوەی هاتمەوە سەرەخۆ و پێکەنینم تەواوبوو. غەم و پەژارەیەکی ڕیشەدار بە سەر هەموو گیان ولەشم دا زاڵ بوو! ڕووم دە هاوکاری خۆشەویست کرد و گوتم :

- دە بووری ئاواپێکەنیم بە خۆم نەبوو، فەرموو بزانم چ نەخشەیەکت دەسەردایە. لە سەرەخۆ ،بەوردی گوتی :

- دوێ شەوێ کتێبێکم دە خوێندەوە بە ناوی" شاعران پارسی گوی کرد"(ئەوشاعیرە کوردانەی شێعریان بە فارسی گوتووە) . خەریکم منیش دە وبە ستێنەدا کتێب بنووسم تەلەفۆنم لە " ناشر " یێك

کردووه و بە لێنی داوە هەرچی بنووسم بۆم چاپ بکا ،تەنانەت ئەورۆ قەرارە پوولێکیشم پێشەکی بداتێ ،پەنجا هەزار تمەن! پێت چۆنە ؟

لە خۆشیان پڕم پێداگرت* ونێو چاوانیم ماچ کرد وگوتم :

- مبارەکە! لێت پیرۆزبێ !

بەلام پرسیارێك بۆمن هاتۆتە پێش ،نازانم چۆنی لێك دەمەوە.

- فەرموو بپرسە، جوابت دەدەمەوە. چ پرسیارێك ؟

- ئاخر من وتۆ سی سالە دۆستین . هیچمان لێك نەشاردۆتەوە. من وتۆی بێسەواد چۆن دەتوانین کتێب بنووسین ؟ ئەوانەی کتێب دەنووسن تەواوی عومری خۆیان بۆ ئەوکارە تەرخان دەکەن . هەمووی دەلێی دەریان . هەر شەپۆلان دەدەن. هێندەی کتێب بخوێننەوە نیوەیان کوێربوون و...

نەیهێشت قسەکانم بە تەواوی بکەم. هەلیدایە وگوتی :

- کاکە گیان ئەوکارەی من دەیکەم سەواد مەوادی پێناوێ. کارەکە یەکی دیکە کردوویەتی من تەنیا لەرووی کاری ئەوان دەنووسمەوە.

- شتی واچۆن دەبێ ،ئەوکارە لێکۆلینەوە و تەحقیقی دەوێ بۆ تەوهین بە توێژکاران دەکەی .

بەوکارە نالێن تەحقیق یا لێکۆلینەوە من ناوم ناوە دۆزینەوە و کۆ کردنەوە.کابرایەك هاتووە دیوانی نالی بە هەزار زەحمەت بلاوکردۆتەوە کە مەسەلەن چەند شێعرێکی فارسی وعەرەبی و تورکیشی تێدایە. ئەمن دەچم شەرحی حالی نالی وئەوچەند شێعرە فارسی یە بێ دەست لێدان لە رووی دیوانەکە دەنووسمەوە پاشان دەچمە زگ دیوانی مەحوی وجزیری وخانی و حەریق ومەولەوی وکێ وکێ ، بە مجۆرە کتێبێك کۆ دەکەمەوە و بلاوی دەکەمەوە . هەم نانی تێدا هەم ناو!

- باشە ئەوە کتێبێکت بەو چەشنە نووسی چەندی تێدایە. دوایە چ دەکەی ؟

- کێ دەلێ کتێبێك ؟ دەیان کتێبی وا دە توانم بنووسم.

- مەسەلەن ؟

- مەسەلەن دە توانم لە ژێر ئەم سەردێڕانە دا سەت کتێب بنووسم:

«شاعران عربی گوی کرد، شاعران کردی گوی عرب،شاعران ترکی گوی کرد، شاعران فارسی و ترکی گوی کرد. شاعران ترکی و فارسی وعربی گوی کرد. شاعران کودی کە هیچ کردی نگفتەاند!!

شاعران کردیکە نمیتوانند بزبان کردی صحبت کنند!! شاعران کردیکە نمیدانندکردهستند! شاعران انگلیسی گوی کرد!!

- ئیتر ئەوە بێ ئینسافیە تائێستا کام شاعیری کوردبە ئینگلیسی شێعری هۆندۆتەوە.

- پێویست ناکا ، بۆ ئەم مەبەستە دیوانی مەحوی ونالی وخانی وئەوکلاسیکە بە ناوبانگانە بکەیە سەرچاوە! دەتوانی بەو لاوانە بێژی چەند شێعریك بلێن وهێندێکی ئای لاویو دارلینگ وبێبی و مێ بی تێخەن وتەواوە!

دیسان خۆم پی رانەگیرا شالاوم* بۆبرد و دە باوەشم گرت وماچم کرد. زانیم ئەوجار چاکی بۆ چووە ورێگەی نان وئاو دەست خستنی دۆزیوەتەوە! ئامادەگی خۆم بۆ هاوکاری دەربڕی ولەودەمەدا پێشخزمەت دووچای لە بەر دەم دانایین. پاش چا خواردنەوە گوتی :

- راستی کاکە باس دەزانی بۆ ئەوەی کتێبەکانیش بە گران بفرۆشین چ دەکەین؟

- هیچ بیرم لێ نەکردۆتەوە. گران فرۆشی قەدەغەیە. وەك دزی وایە .

- ئەوانە قسەی ئیدارەن. بەلێ بەقسە قەدەغەیە بەلام بە کردەوە حەلالە وپوولەکەش لە شیری دایك حەلالترە!

باشە چۆن کتێب بە گران دەفرۆشی .

- دەگەل کتێب فرۆشەکان رێك کەوتووم رۆژی یەکەم کە کتێب بلاوبۆوە دە پازدە دانە بە قیمەتی سەربەرگ دەفرۆشن. رۆژی دوایی بە موشتەری دەلێن تەواو بوو. رۆژەکانی دیکە کە موشتەری بە ئیشتیا بۆکتێب کرین دێ پێی دەلێن .

تەنیا ئەوجلدە مانماوە! ئەویش ئەمانەتە وخاوەنەکەی دەلێ :

-هەزارتمەن!!

# مامۆستا سەید تاهیر هاشمی

تیشکی پڕ تینی هەتاوی گیان بەخش
لە کەلی پڕ پەلی ئێمە ئەنگووت
پڕشە و ورشە و پڕشنگ و درەخش
لە گەڵ ئەو تیشکە جوانە بوون جووت
زەردەیێ کەوتە چیا
لە خەوی بێ سەر و سامانی ولێ کەوتن و ڕەنج
پەنجەیی ڕوونی لە تاریکەیی سینە
کردبە شەمعی شەوی شادی وە
خۆری خستە نساران

* * *

دڵەکەی قوژبنەکەی سینە مەکان
تۆزی چەند ساڵە ئەسەر نوێن نیشتوو
کەس و ناکەس بە درێژایی زەمان
رقی بێ سووچ بە سەر دا رشتوو
لە خەوێ راچەنیا

* * *

هێزی لـــەش دیتنی چاو ، تالعی بێ لارە و لەنج
پاك و رزگار لە سزاو سۆنگ و لە کینە
نە لە سەر باری جەفا ئاخ
نە لە دڵ چوو زەبی خاران

* * *

رۆیی و سەیری چیا و دەشتی کرد
بیستی قاسپەی کەووسوێسکی کێوان
هاتە نێو شار و کەمێ گەشتی کرد
کەوتە خۆشی و سەما

* * *

و تـی نەگبەت کە نەما ، حاسڵی رەنجی منە گەنج
عەقڵ و بازووی بە هێز مایەی ژینە
بێ خوتە و بۆ لە و سەخڵەت
هەر وەکوو ژینی هەژاران

* * *

شێعری خاوەن هونەرە تیشکی هەتاو
بە هەوای لالە و ریحان دەڕوێ
شەونمی تەبعی دەپرژێنێ ئاو
لە گوڵ و بولبولی باغان دە دوێ
بە نەواو بە هەوا

* * *

گوێ دەبیسێ دڵ وەرێ دەگرێ بە سەد عشوە و غەنج*
بووکی دیمەن جلەکەی قرمز و شینە
گەشەیی دادەستم قەرحە*
لە دەس بادی بەهاران

* * *

خاوەنی ئەم نەفەسە کێ یە کەوا
هۆی شادی دڵ و ژینی بەدەنە
بە نەوا خێڵی خەفەت بەر دەس ئەکا
زۆربە هێمن تەرەبی گیان و تەنە
لە تەمەن تاڵی ئەبا

* * *

رووی هێنایەوە رەنگ ، خستیە مووڵووڵ و شکەنج
ناسکی و بێنی خۆشی کەم بە جیهان وێنە
تار و مارە لە نەوای دەرد
وە بە لای کۆمەڵی یاران

* * *

# ملم وتی...!

■ شێرکۆ بێکەس ■

ملم وتی :
زۆر دوور نیە ... هەر پێرێ بوو
لەگەڵ پەتی سێدارەدا راهاتم و
ئاوام لێ هات ...
بەرلەوەی ئەو شۆڕ بێتەوە
من لەپێش دا رام ئەکێشا و یەخەم ئەگرت
من لەپێش دا خۆم هەڵئەدا
ئەچوومە ناو ئەڵقەیەوە
تا وای لێهات
رۆژ لەدوای رۆژ
ژووری ئیعدامم هەر وەکوو گورگێکی دڕ
دەستەمۆ کرد
تا وای لێهات وەك وەردییان*
پەت بێزار بوو
وەك پۆلیسی دوای نیوەشەو
پەت شەکەت بوو
تا وای لێهات بەرە بەرە
ئەو لەپێش من دا دەنوست و
شەودرەنگان
من ئەچوومە سەر دارەکەی هەڵم ئەسان
ئەمووت : وەرە !
زۆر دوور نیە ... هەر پێرێ بوو
لەپێشدا ئازار کێردێکی
زۆر دەم تیژ بوو
لەبەر دەستیان کەروێشك بووم و ئەمزریکان
لە دواییشدا وردە وردە
بە خوێنی خۆم کولم کرد و
ئینجا من خستمە باوێشك دان
بۆ ناونیشان :
ئەوە هەموو ژێرزەمین و قاوشێکی* "ئەبووغەریب"
ئەوە هەموو سەردابێکی توونی* بابای
بەغدای تاوان
لەوەیش زیاتر
ئەوە مووسل و گردی ورەی کەڵ ملەکان*!
زەویم وتی :
زۆر نزیکە هەر دوێنی بوو
لەگەڵ ناڵە و گرمەی رەشی
ناپاڵمدا راهاتم و
وەکوو نەهەنگی برسێتی ی
وەکوو بێرونی تینوێتی
سامی ئەو دێوەشم شکان!
ئەوەیش منم
ئەوە ..... دەنگم
ئەوە ..... رەنگم
ئەوە ..... بالای دەنگ و باسم
ئەوە ..... گوێچکەی سووکی شاخم
تەماشام کە :
نە گوێی دارستانم کەڕ بوو
نە رووبارم زراوی چوو
نە سەنگەرم لەرز گرتی
لە دواییشدا
لاشەی بۆمبا
بۆ مندالانی زۆر گوندی بێ خەندەی من
بوون بە ئەسپی گەمە و یاری
مێژووم ئەڵێ
بۆ ئەمڕوکەیش
لەگەڵ ئەم ژەهرەدا رادێم
رادێم .... رادێم
وەکوو ئاسمان و وەك چیا
هەوا ... منم
ئەو لەمندا ئەتوێتەوە
چەند بێچ بخوات و سەرکەوێ
چنگی ناگاتە گەردنم
کە گوڵێکم هەڵئەوەرێ
گوڵێکی نزم ئەپشکوێ
ژێ یەکی دەنگم ئەپچڕێ
ژێ یەکی تر ئەبەستمەوە
وەکوو پێرێ و دوێنێ و ئێستە
گفتێکە* و داومە بە گوڵ و
بە منداڵ و بەو بەفری خۆشەویستی یە
ئەوەی لەگەڵیا رانەیەم
قەت رانەیەم...رامنەهێنێ و....قەت رانەیەم
هەر یەك شتە
ئەویش تەنیا ژێردەستی یە!!!

# ئێمە و خوێنەر

**بۆکان : سەلاحەدین عوسمانی**

نامە پڕهەست وجوانەکەتمان پێگەیشت لەوهەموو هەستە پاکەت سپاس دەکەین. ئێمە تائێستا (تعشیر)مان نەبیستووە. (تخمیس) مان هەیە بەلام لە (تعشیر) هەوالێکمان پێ نەگەیوە تەخمیسەکەی ئەحمەد هەردی لە سەر شێعری شەوی شێخ نووری سالحمان بەلاوە هەیە. سەرکەوتووبی.

**سەقز : کاك ئەبووبەکر**

نووسیوتە بۆدە سروەدا بەسەرهاتی موسولمانی واقیعی نانووسن؟! وەلامی ئەوپرسیارە ئەوەیە تائێستابەسەرهاتی زۆرپێغەمبەر وپیاوی ئائینی کەورە و شاعیری بەناوبانگ ومەلای زانامان بلاوکردۆتەوە کە هەموویان موسولمانی واقعین! تکایە بۆمان روون کەوە مەبەست لە موسولمانی واقیعی کێ یە؟ دە هەموو ژمارەکانی سروەدا موناجات و وتاری ئایینی هەیە وکە متر کۆواری ئەدەبی وفەرهەنگی تائێستا کاری ئاوایان کردووە.

دە پرسیاری سێهەمدا نووسیوتە ئایا خەیام موسولمان بووە یاخێر؟ بەلێ خەیام موسولمان بووە وشك دە وەدانیە. ئەوشێعرەی دەربارەی بەهار ناردووتە نەگەیوەتە پلەی تەواو، بەلام هەستی شاعیرانەت هەیە وبە تێکۆشان دەتوانی شێعری باشتر بلێی.

**پیرانشار، گوندی شیلمجاران، حوجرەی فەقێیان :محەمەد محەمەد زادە.**

برای بەڕێز خۆشحالین کە لە ڕێگەی سروەوە فێری کوردی بووی. لە باسە ئاینی یەکانی سروە کەلك وەرکرە. بەداخەوە ماموستا ئایینی یەکان لە ناردنی وتاردا هێندێك کۆتایی دەکەن. بە ماموستاکانت بفەرموو باسی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) وخولەفای راشدین بنێرن تا بلاوی کەینەوە. بۆباسی جوغرافیائی وتارمان زۆربۆدێ، کە بەداخەوە زۆربەیان تەواو نین. تائێستاش کەس جوغرافیای پیرانشاری بۆ نەناردووین تا بلاوی کەینەوە. لە وپەندانەی کە بۆت ناردووین بەکاتی خۆی کەلك وەر دەگرین.

**بۆکان: لوقمان نەجاری**

برای بەڕێز. نامە وشێعرە بەهارینەکەت پاش تێپەڕبوونی مانگی یەکەم و دووهەمی بەهار بەدەستمان کەیشت کە وابوو شێعرەکەت بۆبەهاری ۶۸ رادەگرین ئەگەر شیاوی چاپ بوو بلاو دەکرێتەوە. ئەوجارپێشنیارت کردووە کە لە جێگای داستان و چیرۆك گیر و کرفتی مەدرەسە وقوتابی یەکان باس بکەین ورێنوینی یان بکەین، چۆن دەرس بخوێنن وچ بکەن وچ نەکەن. دیسان ویستوونە باسی دژایەتی وناکۆکی نێو بنەماڵە وئەوشوێنەی لە سەر منداڵی دادەنێ بکەین.

وەلام ئەوەیە لە سەر ئەوەش را کە کۆواری سروە فەرهەنگی - ئەدەبی یە باسی گیروگرفتی ناوماڵ وکۆمەل دەکا و زۆرلایەنی ژیان دەخاتە ژێرباس ولێکۆلینەوە. چیرۆك وداستان دەو کۆوارەدا پێویستە زۆرهەبێ، تا نووسەران شێوەی فێربن وقەلەم سامی بشکێ و کوردی نووسین پەرە بستێنێ.

**نەغەدە : ئەبووبەکر عێراقی**

نامە بە هەست وپڕسۆزەکەتمان پێگەیشت لە پێشنیار و رێنوێنی جوان تەژی بوو. ئە، رێنوێنی یە دلسۆزانە بە راستی بۆ پێگەیاندن و گەشەپێدانی کۆوارەکەی سروە زۆر بەسوودن هیواداریـن سەرکەوتووبی. شێعرەکانت درا بە بەشی تایبەتی بۆ هەلسەنگاندن ورا لە سەردان.

**سەقز : ئەحمەد ئەمین پوور.**

نامەکەت کەیشت. ناوی زۆرنەخۆشی و دەردە داریت بۆ نووسیوین کە بە کوردی واژەیەکمان بۆی نیە ئەوانەی ئێمە زانیمان بۆمان نووسی وئەوانی دیکەش نازانین. پێویستیش ناکا ئەم ناوە زانستی یانە کە تایبەتی پزشکین و دە هەموو زبانەکانی دنیادا دەکار دەکرێن بکرێنە کوردی. ئەوەش ناوی چەند نەخۆشی : خوایاربێ دەبی بە دوکتۆر و ئێمەش بەبێ ئەوەی پزیت بدەین لە لات چاك دەبینەوە!.

| فارسی | کوردی |
| --- | --- |
| آبلە | خروێکە |
| سرخك | سوورێژە |
| ئاسم | تەنگەنەفەسی |
| اگزما | بیرۆ |
| کهیر | لیر |
| یبوست | زکەوەستان، قەبزی |
| کورك | کوان |
| سکسکە | نزکەرە |
| یرقان | زەردوویی |
| صرع | فێ |
| فتق | قۆڕی |
| ذات الریە | سەتڵ وجەم |

**نەلۆس : باوکی گوڵ ئەندام.**

نامەکەت کەیشت وپێشنیارەکانت خوایاربێ دە بەر چاو دەگرین. تکایە بەزووترین کات ئەو رۆژنامانەمان بۆ بنێرە تاکەلکیان لێ وەرگرین سەرکەوتووبی.

**سەردەشت : عەبدوڵلا پشدەری**

وێڕای سپاس لە نامە و پەندە جوانەکانت، بۆوەدەست هێنانی

ژمارەکانی رابردووی سروە دەتوانی لە کتێبخانەکانی مەهاباد- بۆکان سەقز پرسیاربکەی · تەخمیسەکەی تایبەتی لە کتێب فرۆشی حاجی سمایلزادە هەیە بنێرە ،بیکرە · سەرکەوتووبی ·

**سنە : کاک ن · ب**

" دایك وباوکم لە هودێکیان هاویشتم و بەرقیان لە سەر کووژاندمەوە و هەتا توانیان کوتایانم " ·

بەڵێ · چاکتان خوێندۆتەوە · دایك وبابێك منالەکەیان لە هودێك دازیندانی کردووە و هەتا توانیویانە کوتاویانە · ئەو نامەیە لە بارەی کچێکەوە نووسراوە کە هۆی دارکاری خۆی ئاوا شی کردۆتەوە : ·

دایك و باوکم دلبەندی مالی دنیان · کاریان بەوە نیە ئەوەی دێتە خوازبێنی تەمەنی چەندە و چ دەکا یا چۆن ژیانی داهاتووم دابین دەکا · ئەوان چاو لە پوول وپارە ومال وحالی کریار دەکەن هەتا بزانن چەندەی پارە لێ هەلدەوەری و چەندی شیربەها و پوولی نەغد پێدەدری وچەندەی زێڕ پێدەکڕدرێ ، جا فەرق ناکا ئەوەی هاتۆتە خوازبێنی پیرە پیاوێکی بە سالاچووبێ یا هەرزە کارێکی تێ نەگەیشتوو · ئەو رۆژەی کە هاتنە خوازبێنیم و ئەمن چاوم لەشدریکی داهاتووی ژیانم کرد بە دلمەوە نەنووسا کە هیچ ، نەمدە توانی فکریش لەو پێوەندیە بکەمەوە بەلام کاتێك بە چەند هۆی زۆر مەنتیقی ئاکامی تالی ئەم زەماوەندەم بۆ روون کردنەوە دەسکوت خەتایەکی گەورەم کردوو د و ···· · کاتێك وەهۆش هاتمەوە دیتم بەدەنم رەش هەلگەڕاوە و هاوکی بەرێزم شل وکوتی کردووم ئێستاش کە ماوەیەك لە سەر ئەو رووداوە تێپەڕیوە باوکم دەیهەوێ ئەمن بە ژن بەژنە بە شوودا · نازانم روو لە کێ کەم و هانا بۆ کوێ ببەم · بۆ دەبێ ئەمن قوربانی ئەوویستە هەلەو بێ مانایەی باوکم بم ؟ ····

**سەرپولی زەهاب : کاک سمایل · ئ**

کاکی بەرێز : ئەو هەموو راوەستاوی ولە خۆبردوویی وسەبر وئیمانی تۆ بە هیچ نووسراوەیەك رێز ناگیرێ · قەلەم شەرمێ دەکا لەو زولمە بدوێ کە لەهاوسەر ومندالانی تۆو هەزاران هاوولاتی دیکەمان کراوە · چۆن وبە چ چەشنێك دەکرێ دواکەوتوویی و چارەرەشی گەلێك بە قەلەم بنووسرێ · رستەکانی نامەکەت هەر چەند کە ساکار بوون بەلام لە دلی هەموو خوێنەرێکدا کار دەکا وزەنگی خەتەر لە بن گوێ لێدەدا · کەس ناتوانێ ئەو رووداوەی کە ئەتۆ باست کردووە بێنێتە بەر خەیال ·

بلێی چون بێ ئەودەمە پرلەزام و پەژارەیەی کە دایك وکوڕ ، گول وبولبول وگیانان ما لاوایی لێك دەکەن · بلێی ئەو دایکەی کە منالی شیرخۆرەی مەمك مژەی لەزار دایە و لەباوەشیدا دوا هەناسەی دەکێشێ چ بکا و چۆن چاو لەو دیمەنە بکا · چ بکا ؟ یا لێوەچووکەکانی کورپەی ماچ بکا ولەشی ژاکاوی رولەکەی لەئامێز بگری ؟ بلێی بۆ خۆشی نەمرێ ؟ بەلێ فرینی رووحی دایك دەگەل منالەکەی شتێکی ئاساییە · ئەگەر وانەکا چ بکا ؟ ئایا لایەنگرانی مافی مەشەرو زۆرداران و حقووق زانان وئەوانەی وەبەشەر دەچن گوێ دەدەنە هاواری ئەو دایکەی کە ئاوا دەنالێنێ ؟ ئایا زایەلەی دەنگی چارەرشان کارلە سازمانەکانی فریوکاری نێو نەتەوایەتی دەکا ؟ ئایا ئەو گازە سەمیانە وئەو چکە پڕ مەترسیانە تەنیا بۆ کوشتنی گەلی کورد ساز کراون وئەوانەی سازیان کردوون یادەکاری دەکەن هەتا هەتایە هەر وا دەمێننەوە ؟ هەتا کەنگێ دەتوانن هاواری گەلی زۆر لێکراو بشارنەوە ؟ ئا ، دۆستی ئازیز دەستی گەرمی تۆ کە هێزی تۆلەسەتاندنەوەی تێدایە بەتوندی دەگوشین و فرمێسکی غەمی چاوەکانت دەسڕینەوە وباوەشی گەرمی برایەتیت بۆدەکەینەوە وبەئاواتی رۆژی بەلێن دراو کات ژمێری دەکەین ، هەتا سەرکەوتنی چەوساوان بە سەر چەوسێنەران هەنگاوێك زیاتر نە ماوە ·

**نامە و دیاری ئەو ئازیزانەشمان بەدەست گەیشتووە**

**بانە :** کاك زاهیر رزایی ـ خوشکە نەرمین ح ـ کاك عەبدولباقی زەحمانی ـ ئەحمەد سەعید قادر ـ بورهان غەسالی ـ عەبدوللا رفاعی ·

**نەغەدە :** سەیید بەهاسەدرو ساداتی مەسعوود فازلی ـ کامیل حوسێنی بەگی (چیا) ـ موراد سوهرابی ـ مامەی فەلاح ـ سەید عەبدولکەریم حەبیبوللا ـ مەسعوود فازلی ـ خدر حەسەن ـ دژوار چۆمانی ·

**نیشابوور :** سەلاحەدینی محەمەد ئەمین زادە

**سائین دژ :** سەلاحەدینی شێربەگی

**باختەران :** سالح قادر

**کەرەج :** رزکار بارزانی ـ تەحسین سەلیم شیروانی

**ورمێ :** یووسف عەبباسی

**تەورێز :** بایەزیدی وەتمانکەل ـ سەیید کەمال لەتیفی

**ئەهواز :** محەمەدی ـ ئیبراهیم ئەعەمی ـ رەشید ئەحمەدی

**گوندی کلەکێن :** رەحمان حوسێنی

**تاران :** سەباح محەمەد عەبدوللا ـ جەمال شێخەلیسلامی ـ عەتا ئیسمائیلی ـ ئەیووب رەشیدی

**جەلدیان :** خوشکە سوعدا حوسێنی

**ئەندیمشك :** یووسف رەحیمی

**مەریوان :** رەئووف محەمەد پوور ـ ئازاد مارف ـ غەفوور بەرق ـ قادر حەیدەری

**مەلایر :** رەحیم تەرەغە

**رەوانسەر :** ناسرەدین شەریف زادە

**ئیسفەهان :** رەفیق مزووری

**کازروون :** مستەفا شێخە

**دێهلوڕان :** مەحموود نووری ـ محەمەد نووری

# شەو

شەو کە سێپرسی لە خۆ دەرخستنی پەروانە شەو
ئەو وتی ناتێگە یشتوو،تەجرەبەی مەردانە شەو

هەرسیابەختانی عیشقە مەزهەری نووری هودان
شەونەبێ ئەستێرە مەستوورن، بەکەم مەڕوانە شەو

ئەم سیارۆزی منە پۆشیوییە عەیبی کەسان
ئاشکارە، سەتری ئەحوالێ گوناهکارانە شەو

بۆیە زولمەت پۆشە، نووری ئەهلیجەوهەر دەرکەوێ
سەیری حەققی کەن لە سەر ئەم ماە وئەستێرانە شەو

نەبووە،نابینی لە شەو مەحرەمترێ تا رۆژیحەشر
پەردە پۆشە، هەمدەمە هەمدەردی عوشاقانە شەو

شەو هەمووشە و چاورێیە رۆژهەلێ، هەر رۆژهەلات
مەحوە سەرتاپالە بەرپێیا فیداکارانە شەو

خود پەرستینە !لە شەو فێری پەرستن بن، کە خۆر
هەر دیاری دا ،بە دەوری سەریە دا قوربانە شەو

فیرقەتی رۆژە دەرۆونی کردە داغێکی سیا
وەك منی سەودازە دە ئاتەش زەدەی هیجرانە شەو

گەر فیراق ئاگرهەموو رۆژێ لە جەرگی بەر نەدا
بۆهەمووشەو تیرە دڵ،سینەی زوخاڵستانە شەو

تیرەگی وا فەزلی بۆنادەم بەسەر رووناکییا
مەنشەیی ئیزهاری جیلوەی فەیزی سبحەینانە شەو

هەر لە تاریکی شەوایە رێ درێ ئەهلی نیاز
رازی دڵ ئیفشابکەن،خەڵوەتگەهی خاسانە شەو

تێ بگە بۆچی بە جانن تالیبی شەو عاشقان
نیوە شەو بوو، وەعدەگاهی هاتنی جانانە شەو

هێندە ساحیب سیرڕە(میعراج)وشەوی(قەدر)و(بەرات)
خاسە جاتی ئەون وموممتازە بەم ئەسرارانە شەو

هەرکەسێ تالیب بە دوڕی مەعریفەت کۆ کردنە
پڕلە دوڕ دەریایەکی بێ مەهلەکەی خنکانە شەو

وەك( خضر )ئاوی حەیاتی فەیزی حەق عافێتیە
ئەوخودا پێداوە " مەحوی"تاسەحەرنا لانە شەو

■ **مەحوی**

**پێنج خشتەکی ئەحمە دهەردی لە سەر غەزە لێکی " شێخ نووری ".**

قەت نە دەی ئازاری گیانی مە ست وبێدارنی شەو
خۆت نە خە یتە بەرشە پۆلی ئەشکی بێپایانی شەو
ئەی کچی خواوەندی جوانی وەی چرای دیوانی شەو
**خۆت بپارێزە لە ئاهی دڵ بریندارانی شەو**
**نەك خوداناکەرد گیرابێ دوعای نا ڵانی شەو**

وێڵم وتاریکە دەورم فەرشی رێگەم مە ینەتە
بێ کەسم تە نها ئەنالّم مەرگی خۆمم عەزرەتە
سازی ئاهەنگی شەوانم سۆزی جەرگی لەت لەتە
**یاوەر و یاری ئە نیسم ئاهوئەشکی حەسرەتە**
**ئافەرین ئەی "بارك اللە" دیدە یی گریانی شەو**

وانە زانی دە ستی غەم یادت لە دڵدا دەرئەکا
ئە شکی خوێنینم دە لیلە بۆ کە سێ باوەڕ نەکا
گیانە کەم بەوتیشکی چاوەی شەڕلەگەڵ ئەختەرئەکا
**دڵ ئە بێتە قەترەیێ خوێن ولە دیدەم سەرئەکا**
**هەر کە رابووری بە دڵما سوحبەتی جارانی شەو**

هاوده مێ فەرمووی لە بەرچی کردەوەت گریانە هەر
تافی لاوێتیتە ،لاوی قەڵبەزەی سەیرانە هەر
من وتم سە یران وخۆشی پێشکە شی شادانە هەر
**ئە شکی حەسرە ت لازمی جە معی سیابەختانە هەر**
**شەونمی سوبحە دەلیلی قە ترەیەك گریانی شەو**

هەولێ زۆرمدا لە داوی زولفی ئەوبێ مروەتە
دە رچم ود وایی بهێنم بەم عەزاب ومەینەتە
**(نووری) لەم پێچ وخەمی زولفەتەجاتت زەحمەتە**
**لای سەخی تەبعان مەحاڵە روخسەتی میوانی شە و**

نووری روخسارت وە دە رخەدەردی بێ دەرمانە شە و
زوڵمەتی زولفت لە سەر رووتە لە رۆژ میوانە شە و

دوێ شوکور مەردانە من رێم بردە ناوزولفی رەشی
تابزانن خەڵکی موڵکی دڵ: قە ڵای مێردانە شە و

هەر لە مە غریب تابە یانی بێ وچان د ێت ودەچێ
هە ر لە دووی خورشیدی خاوە ر وێڵ وسەرگەردانە شەو

کوێرو نابینایە ئێستا ئەو لە داخی رۆژی ر وو ت
بۆیە رە ش پۆش وفە قیرو مات وبە ستە زمانە شە و

قەدری شەو چابگرە چاوم شە مع وپەروانە دە ڵێن
سۆز وگریەی شە مع هەرشە و سووتنی پەروانە شەو

عاشق ومە عشووق لە رۆژدا خۆ دە پارێزن لە خە ڵك
گەر پە نای چاکت دەوێ بۆئەودووە ؟ بڕوانە شە و

هە ستە کامیل بە سیە بێداری برۆ لێی وە رکە وە
تاولات بێ دە نگ وباسە و تالە رۆژ میوانە شەو

# شەو

**■ سەید کامیل ئیمامی**

**محەممەد کـوردە** ٦

یوربیدس سێهەمین نووسەری سێ کوچکە گەورەکەی یوونان ( واتە پاش ئەسخیلوس و سۆفۆکلیس) لە ساڵی ٤٨٠پ.ز لە دوورگەی سالامیس لە نزیک ئاتێن لەدایک بووە . بەسەرهاتێکی تر هەیە سەبارەت بەرۆژی لەدایک بوونەکەی، گوایە لە رۆژی سەرکەوتنە گەورەکەی یوونان ـدا کە هێزی دەریایی ئاتێن بەسەرکردایەتی تیمستۆکل بەسەر خەشایارشای سەرکردەی لەشکری ئێرانی یەکاندا سەرکەوت. یوربیدس لەدایک دەبێ. ئەگەر ئەمە راست بێ ئەوا لە ساڵی ٤٨٤ پ .ز هاتووەتە دنیاوە و لەخێزانێکی بەرزدا پەروەردە بووە.

"مەندسارکید"ی باوکی دانیشتووی شاری "فلیە" و یەکێک دەبێ لەبازرگانەکانی سالامیس وپیاوێکی تێگەیشتوو و زانا بووە....پێشکەوتنی یوربیدس وهاتنەناو گۆڕەپانی هونەرەوە لەرێی هاندانی باوکی یەوە بووە،لەپێشدا وەرزشکاری لێهاتوو، نەقاش وپاشان فێری مۆسیقا بووە هەر باوکی بووە هانی داوە لە ژێردەستی مامۆستاکانی سەردەمی خۆیدا فێری فەلسەفە بێت وپاشانیش بوو بەدراما- نووسێکی گەورە .

زانراوە کە لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا دەستی بە کاری شانۆگەری کردووە ، بەڵام بەو بەڵگانەی لەبەر دەستدان چەند ساڵ پاش ئەوەش لە فێستیواڵی شانۆگەریدا بەشداری کردووە، لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا دەستی بە نووسین کردووەو بەدرێژایی ٥٠ ساڵ خەریکی ئەمکارە پیرۆزە بووە،واتە شەست ساڵی رەبەق خەریکی کاری شانۆگەری بووە. ٩٢، شانۆنامەی نووسیوە،٢٢ جار لە پێشبرکێی فێستیواڵی دیۆنیزیۆس دا بەشداری کردووە. بەڵام پێنج جار خەڵاتی پێ دراوە. چەند بەڵگەیەکی گرینگ سەبارەت بە رەفتاری یوربیدس هەیە کە دەگەیەنێ نووسەرێکی بێ لایەن بووە وسەروقاڵی لەگەڵ کاری دەوڵەت و بازرگانی دا نەبووە،خۆشی لە ئەرکی سوپایی نەهاتووە و بەشداریشی نەکردووە . گوایە هەموو مەبەستی سەرەکی وی تەنها نووسینی دراما وشانۆنامە بووە.. لەو ٩٢ شانۆنامەیەی کە نووسیویەتی تەنها ١٩ شانۆنامەمان بۆ ماوەتەوە، کە ١٧ شانۆنامەی تراژێدی ویەک شانۆنامەی بە ناوی " ئالیست" دڕامایەکی خەیاڵی یە و بە خۆشی و شادیەکی چاوەروان نەکراوەوە کۆتایی پێ دێت . ئەوی دی شانۆنامەی"سیکلۆپها"یە ئەویش دڕامایەکی پڕ لە هەجووە، لە ئەفسانەی ئیلیادەوە وەری گرتووە.

یوربیدس نووسەرێکی گۆشەگیر بووە و دوور لە خەڵک ژیاوە و زۆربەی کاتی خۆی بۆ خوێندنەوە و چێژ

لێ وەرگرتن لە سروشت تەرخان کردووە....

لە فەلسەفەشدا یەکەمجار لە ئاناکساگۆراس، پرۆتاگۆراس وپاشان لە سوقرات نزیک بۆتەوە. دژایەتی یەکی سەرسەختی هونەری لەگەڵ سۆفۆکلیسدا هەبووە و لایەنگرانی سۆفۆکلیس و ئەسخیلوس، پلەی کاری یوربیدس لەخوار کاری ئەم دوانەوە دادەنێن. بە شێوەیەکی گشتی کاری هونەری یوربیدس بە لادان لە نەریتی شانۆی کلاسیک دەزانن. هێندێکی تر باوەڕیان وایە کە یوربیدس باشتر لە سۆفۆکلیس و ئەسخیلوس لە کەسەکانی ناو کۆمەڵی کۆڵیوەتەوە

یوربیدس خۆشی لەخواکانی یوونان نەهاتووە و بە چاوێکی خراپ سەیری کردوون ئەوانە بوونە هۆی ئەوە بەناوی مولحید (ملحد) تاوان ـ بار بکرێت وبدرێتە دادگا، رقی لەچینی دەسەڵاتدار و حکوومەت بووە، ئەم رەفتارانە وای لێکردووە پلە وپایەو رێز وخۆشەویستی لەناو خەڵکدا کەم بێت. یوربیدس لە سوفوکلیس وئەسخیلوس زیاتر شانۆنامەی ماوەتەوە. لەبەر ئەوە پاش مردنی بۆتە خاوەن رێزوخۆشەویستی یەکی بەرز وتا ئەمرۆش کارەکانی لەزۆربەی وڵاتانی دنیادا دەهێندریتە سەر شانۆ. ئەو شانۆنامانەی لەو بەدەستگەیون ئەمانەی خوارەوەن :

١ـ شانۆنامەی ئالیست (ساڵی ٤٣٨ پ.ز.نووسیوەتی)

٢ـ شانۆنامەی میدیا (ساڵی ٤٣١ پ ز.نووسیوەتی)

٣ـ شانۆنامەی هیپۆلیت (ساڵی ٤٢٨ پ.ز.نووسیوەتی)

٤ـ شانۆنامەی نەوەکانی هیراکلس (سنووری ساڵانی ٤٣٠ـ ٤١٥ پ.ز.نووسیوەتی)

٥ـ شانۆنامەی ئاندوماک (سنووری ساڵانی ٤٣٠ـ ٤١٥، پ.ز نووسیوەتی)

٦ـ شانۆنامەی هیکیوبا (سنووری ساڵانی ٤٣٠ـ ٤١٥ پ.ز نووسیوەتی)

٧ـ شانۆنامەی هیراکلس (سنووری ساڵانی ٤٣٠ـ ٤١٥ پ.ز. نووسیوەتی)

٨ـ شانۆنامەی تکاکەران (سنووری ساڵانی ٤٣٠ـ ٤١٥ پ.ز. نووسیوەتی)

٩ـ شانۆنامەی ئەیون (سنووری ساڵانی ٤٣٠ـ ٤١٥ پ.ز. نووسیوەتی)

١٠ـ شانۆنامەی ژنانی ترێوا (ساڵی ٤١٥ پ ز، نووسیوەتی)

١١ـ شانۆنامەی ئەلیکترا (سنووری ساڵانی ٤١٧ـ ٤٠٨، پ.ز. نووسیوەتی)

١٢ـ شانۆنامەی ئەفجینیا لەتاوریس (سنووری ساڵانی ٤١٧ـ ٤٠٨ پ.ز.نووسیوەتی)

١٣ـ شانۆنامەی هێلێن (ساڵی ٤١٢ پ.ز.نووسیوەتی)

١٤ـ شانۆنامەی ژنانی

فنیقی ( سالی ٤٠٩ پ .ز نووسیویەتی)

١٥- شانۆنامەی ئۆریست (سالی ٤٠٨ پ .ز نووسیویەتی)

١٦- شانۆنامەی باکائە ( نەزانراوە کەی نووسیویەتی)

١٧- شانۆنامەی ئەفجینیا لە ئۆلیس ( پاش مردنی پێشکەش کراوە )

١٨- شانۆنامەی سیلۆپ و یەک شانۆگەری «سارتیر» .

ئەوەی شایانی باسە شانۆنامەکانی یوربیدس بوارێکی فراوانی بۆ هونەرپیشەکان خۆش کردووە. ئەویش بەهۆی پێشڕەوی هەستی شاعیرانەی خۆیەوە بووە.

ناوەڕۆکی سەرەکی زۆربەی شانۆنامە( کۆن و کلاسیکەکان )ی پێش یوربیدس پەیوەندی نێوان مرۆڤ و هێزی بێ کۆتایی دنیایی وخواکان وئەفسانەکان بووە بەڵام شانۆنامەکانی یوربید -س کێشمەکێشی نێوان کەسێک لەگەڵ کەسێکی تر دەردەخات .

هەروەک لە سەرەوە گوتمان یوربیدس زۆربەی کاتی خۆی بۆ خوێندنەوە و چێژ وەرگرتن لە سروشت تەرخان کردووە وزۆرتێکەڵاوی خەڵکی نەکردووە. ئەوە لە لایەک ولە لایەکی ترەوە ئەو گیروگرفتانەی یوربیدس لێی کۆڵیوەتەوە نیشانی داوە لەگەڵ ئەو رۆژگارەدا نەگونجاوە، ئەم باسانەش لای خەڵکی بوونەتە جێی پرسیار وسەرسوڕمان . بۆ نموونە :

١- عاشق بوونی فێدرا بە زڕ کوڕی خۆی .

٢- تاوانی میدیا بەرامبەر بە نەوەکانی خۆی .

ئەمانە وای لە یوربیدس کردووە رێز وخۆشەویستی لەناو خەڵکدا کەم بێتەوە یوربیدسی رۆمانتیک وپەریشا -ن حاڵ ، جۆرێکی تری لە تراژێدیا بەخەڵکی یوونان ودنیا نیشان دا وپاشانیش لە هەموو جیهاندا ناسراو رێز وپایەی بێ سنووری خۆشەویستی بەخۆیەوە دی .

یوربیدس دوو جار ژنی هێناوە ولە هەردووکیاندا ئەنجامی جیا بوونەوە و ناکامی بەدەست هێناوە، لە هەر دوو ژنەکەی خاوەنی چەند منالێک بووە.

ناوەڕۆکی زۆربەی شانۆنامەکا -نی لەسەر بنەڕەتی ( فەلسەفەی ئیدئۆلۆژی ) داڕشتووە...کەسانی چیرۆکە شانۆنامەکانی لە خەڵکی (عامیانە) پێک هاتوون و بەزمانی سادە و عامیانە گفتوگۆ دەکەن، هەولێکی زۆری داوە بۆنوێ کردنەوەی ئەفسانە کۆنەکان وخولقاندنی باسی نوێ بۆ شانۆنامەکانی .ئەو شانۆنامانەی خەلاتی فیستیوالی دیونیزیوسی پێ وەرگرتووە ئەوانەی خوارەوەن :

١ـ شانۆنامەی ئالیست
یەکەمجار لە فیستیواڵی ساڵی ٤٣٨ پ.ز. هێنرایە سەر شانۆ وپێشکەش کرا. ئەم شانۆنامەیە بەشێکە لەیەک شانۆنامەی تترالۆژی و لە بارەی ئەفسانەیەکی کۆنە سەبارەت بە ئولومپ. بەڵام یوربیدس کردوویەتی بە درامایەکی خێزانی،کۆمەڵایەتی وفیداکاری کە عیشقی ئافرەت بەرامبەر بەمێردی نیشان دەدات.

٢ـ شانۆنامەی مێدیا
بەناوبانگترین شانۆنامەی تراژێدی یوربیدسە و لە فیستیواڵی ساڵی ٤٣١ پ.ز پێشکەش کراوە و یوربیدس خەڵاتی سێهەمی پێشبڕکێی پێ وەرگرتووە. قارەمانی شانۆگەرییەکە ژنێکە بە ناوی مێدیا وباوکی بەجێ دێڵێ وبراکەی دەکووژێت بۆ مەبەست وعیشق وفیداکاری ولەپێناوی گەیشتن بە دەزگیرانەکەی ئەو کارە دەکات.

٣ـ شانۆنامەی هیپۆلۆتوس: یەکەم جار لە فێستیواڵی ساڵی ٤٢٨ پ.ز. هاتە سەر شانۆ، ئەویش بە بەشێک لەیەک شانۆنامەی تترالۆژی ناسراو یوربیدس خەڵاتی یەکەمی پێ وەرگرت. لەم شانۆنامەدا فیدرا عاشقی زڕ کوڕەکەی خۆی دەبێت.

٤ـ شانۆنامەی ژنانی ترێوا: شانۆنامەیەکی زۆر بەناوبانگە. یەکەم جار لە فێستیواڵی ساڵی ٤١٥ پ.ز. بەناوی بەشێک لەشانۆنامەیەکی تترالۆژی لەسەر شانۆ پێشکەش کرا و یوربیدسی شاعیر خەڵاتی دووەمی پێشبڕکێکەی پێ وەرگرت. ئەم شانۆنامەیە سەبارەت بەو شەڕە گەرمەی نێوان ئاتێن وئەسپارتەوشانۆنامەکە زۆر بەتوندی دژی (شەڕ) دەوەستێتەوە. پێنجەمین خەڵاتی نازانین بۆ کام شانۆنامە وەرگرتووە.
شانۆنامەی ئەلیکترا پاش شانۆنامەی مێدیایە و بە باشترین شانۆنامە دادەنرێت لەوانەیە لەساڵی ٤١٣ پ.ز. نووسرابێ. ئەم شانۆنامەیە هەمان باسی شانۆنامەی خوئەفۆروئەی ئەسخیلوس و ئەلکترای سوفۆکلیسە. بەڵام لای یوربیدس گۆڕانکاری تێدا کراوە.
لەم شانۆگەرییەدا ئۆرستس لەگەڵ (پیلادس)ی خۆشەویستەکەیدا بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی «ئاگامەنۆن» بۆ ئارەگوس دەڕۆنەوە و بۆ پەیدا کردنی خوشکە ئەلکترا دەکەونە ڕێ،ئیتر نازانرێ ئەم شانۆنامەیە خەڵاتی پێنجەمی وەرگرتووە یان شانۆنامەیەکی تر.
یوربیدس بێجگە لەوەی شاعیر و نووسەر بووە وەرزشکارێکی بەتوانا بووەو کۆمەڵی خەڵاتی زۆری لە پێشبڕکێی وەرزیشدا وەرگرتووە هەروەها کاری هونەری نەقاشی کردووە و لەم بوارەشدا بەرهەمی هەبووە.
یوربیدس لە ساڵەکانی دوایی ژیانیدا بۆمەقدۆنیە کۆچ دەکات.خەڵکی مەقدۆنیە ڕێزێکی زۆری لێدەنێن. لە ماوەی ئەو هەژدە مانگەی لەوێ دەژی جێگای ڕێزێکی زۆری خەڵکی دەبێ، سەر ئەنجام لە زستانی ساڵی ٤٠٧ پ.ز. ولە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا ماڵ ئاوایی لە دنیای بەرینی هونەری، شانۆ دەکات ودەمرێ و بە نەمری لە دنیای هونەرد دەمێنێتەوە.خەڵکی مەقدۆنیە مەیتەکەی زۆر بە شکۆ و ڕێزەوە بۆ ئارامگای رازاوەی "پیلا" بەڕێ دەکەن وئەوێ دەبێتە شوێنی هەتا هەتایی ئەو بلیمەتە.
سوفۆکلیس بۆ بەسەر کردنەوە وڕێز لێنانی یوربیدس لە هەمان ساڵی مردنەکەیدا ولە فێستیواڵی دیۆنیزیۆسدا دەستەی کۆرسی شانۆنامەکەی بەجل وبەرگی شیوەن گێڕییەوە دەهێنێتە سەر شانۆ....
سەرئەنجام
یەکەم: ئەسخیلۆس بوو ژمارەی کاراکتەری لە

یەکێکەوە کرد بە دوان و بۆ یەکەمجار لەژێر دەستی ئەودا گرنگی درایە دەستەی کۆرس لە قسە وگفتوگۆدا . پاشان سوفوکلیس ژمارەی کورسی کرد بە ١٥ کەس و ژمارەی کاراکتەری لەسێهە- مین کەسەوە زیاد کرد .

دووەم: باشترین تراژێدی ئەو کاتە پەیوەند بووە بە بەسەرهاتی ژیانی خێزانە بەرز وبەناوبانگەکان . بۆ نموونە: شانۆگەری ئۆدیب و ئەنتیگۆنا...ی سوفۆکلیس. بەڵام لای یوربیدس خەڵکێکی سادە وساکار و بە زمان و شێوەی ساکار دەدوێن نەک وەک سۆفۆکلیس کە رستەی رەنگاورەنگ و بریقەداری بەکار هێناوە.

سێیەم: ئەسخیلۆس گێرمە وکێشمەی نێوان خوا ومرۆڤ و مرۆڤ ومرۆڤ هەر وەک لەشانۆگەری "ئێرانی یەکاندا دەردەکەوێت بەکار هێناوە. سوفۆکلیس کەسانی لەسەر دەستووری سایکۆلۆژی دارشتوون و یوربیدسیش فکری "ئایدۆلۆژی" هێناوەتە ناو شانۆ .

چوارەم: ئەنجامی چیرۆکی شانۆنامە دەبێ لەچیرۆکەکەوە سەرهەڵدات نەک خواکان دەست خەنە ناو باسەکەوە هەروەک لە شانۆنامەی مێدیادا دەردەکەوێت خواکان دەبێ تەنیا لە رووداوی دەرەوەی شانۆنامەکە و دەرەوەی هێزی مرۆڤ دا دەسەڵاتیان هەبێ. هەر وەک لە شانۆنامەی ئۆدیبدا بەم شێوەیە .

پێنجەم: یوربیدس گرنگی یەکی زۆری بە ئافرەت داوە وئافرەت لەشانۆنامە کانیدا دەوری قارەمانیەتی دەبینن. و گرینگی تازەی

داوە بەدەستەی کۆرس و بوارێکی فراوانی بۆهونەری کاراکتەری خوڵقاندووە. هەروەها سەرپێچی لە دەستووری کلاسیک کردووە. لەبەر ئەوە بەوێرانکەری رێبازی کلاسیک ناسراوە .

شەشەم: لای ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس دەستەی کۆرس وەک یەکێک لە کەسەکانی چیرۆکە شانۆنامەکە دەوری هەیە ،کەچی لای یوربیدس بەم شێوەیە نیە .

حەوتەم: سۆفۆکلیس کەسەکانی وا نیشان داوە کە دەبێ چۆن بن لە کاتێکدا یوربیدس کەسەکانی وا دەرخستوون کە هەبوون یان لە واقیعەکەدا هەن ، بەو شێوەیە نیشانی داون ولێی کۆڵیونەتەوە .

هەشتەم: ئەسخیلۆس باوکی تراژێدی لەگەڵ واقیعەکەی خۆیدا ژیاوە. بە شانۆ و ژیانی یەوە بەرگری لە وڵات و گەلەکەی دژی بێگانەکان کردووە وسەرقاڵی هەستی گەرمی خەڵکی بووە....بەڵام یوربیدس دوور لە خەڵک ژیاوە و زۆربەی کاتی خۆی بۆ خوێندنەوە وسەیرکردنی سروشت وچێژ لێ وەرگرتن تەرخان کردووە....

سیاست روز دارای مبنای قانونی است و بصورت قانونی و عادی قابل انجام است ، تلاش و اصرار بر سیاسی کردن آن چه معنایی دارد ؟! وقتی که بتوان بدون دغدغه خاطر و با امید به آیندهء روشن به احیاء و ترویج زبان و ادب خود بپردازیم ، انداختن این مسائل روی دندهء سیاست به صلاح کیست ؟ ما شاگردان مرحوم استاد هیمن تحت نظارت دقیق و مستمر ایشان با بررسی تمامی جوانب کار به تاءسیس مرکزی برای نشر فرهنگ و ادب کردی و انتشار مجلهء وزین و محبوب سروه اقدام کردیم و دیدیم که نتایج بررسیهای بعمل آمده کاملاً با حقیقت منطبق بوده است . احیاء و ترویج زبان و ادب ما از نظر قانون اساسی بلااشکال بود . این را همه می‌دانستند ، اماهیچ فعالیت جدی در این رابطه مشاهده نمی‌شد ! ابهامی پیچیده در خفا مانع از هر گونه اقدام بود . کاری که استاد کرد رفع این ابهام بود . او نه تنها نشان داد که آرزوی تاریخی مردم ما تحقق یافتنی است ، بلکه آشکارا اعلام کرد که استفاده نکردن از فرصت بدست آمده - که میوهء شیرین انقلاب بوده و هست - یك خیانت و ناسپاسی بزرگ است . مرکز تاءسیس شد، سروه منتشر گردید . مردم ما و بویژه جامعهء عزیز و ادبدوست با استقبال بی نظیری از این جریان حمایت و پشتیبانی کردند . از طرف دیگر بسیاری از دست اندرکاران و مسئولین محترم کشوری نیز مثبت و مفید بودن این جهاد مقدس را بعینه تجربه کردند . نتیجه اینکه شك و شبهه از هر دو سو برطرف شد و تفاهمی که مبنای قانونی و دینی دارد عینیت یافت . در چنین وضعیتی غامض کردن مسائل نه تنها مشکلی را حل نمی‌کند ،بلکه می‌تواند مشکل آفرین بوده و در برههء حساس کنونی ضمن تضعیف روند مثبتی که در امور فرهنگی و ادبی و هنری کشور احساس میشود ، بطور جدی این حرکت شکوهمند را نیز ابطر نماید .

ادامه دارد.

## پاشماوەی پەراوێزی بەیتی هەمزاغا

۵۷) پارچەی ئاوریشم ـ هەژار ـ فەرهەنگۆکی شەرەفنامە . نازك لەطیف، گەردەن زەریف، لەبسی شەریف ، کیمخە و قەدیف.

من دی بوەخت ، ئەو نیك بەخت، ئیرۆ لتەخت فەغفور بو ـ مەلای جزیری ـ اگر کمخاکنی، اطلس بپوشی

همان " سفتوسر " سبزی فروشی ! باستانی پاریزی ـ حماسەء کویر

۵۸) ( ناوی قەدیمی میاندواو مەرحەمەت ئاباد " مرحمت آباد" بووە... هۆیەکی تری گەشە کردنی مرحمت آباد ئەوە بورکە لە سەردەمی ئاغا محەمەدخانی قاجار ( آقامحمدخان قاجار )دا تاقمێك لە خەڵکی کرمان سەبارەت بە مەبەستگەلی سیاسی دوور خرانەوە بۆ ئازەربایجان و شارەکانی تری ئێران ، یەکێکیش لەم ناوچانە کە بۆ دوورخراوە کرمانیەکان دەست نیشان کرا مەرحەمەت ئاباد بوو . پایان نامە ـ جغرافیای انسانی میاندواب ـ نگارش محمودمحمودپور ـ سالتحصیلی ۳۶ـ۳۵ ص ۷ـ۶ ، شمارەء پایاننامە ۳۷" کتابخانەء دانشکدەء ادبیات و علوم انسانی تبریز ) .

ـ لە تەوزیحاتی مامۆستا قادرفتاحی قازی ـ

۵۹) کوری قادرئاغای ئیندرقاش. بروانە پەراوێزی ۹.

۶۰) بە سێ یەك بەش نەماوە : یانی سێ یەکی نەماوە . سێ یەك بەر بە کەسێك دەڵێن کە دەچێتە سەر زەوی و زاری یەکی دیکە و کار دەکا . زەوی و توو و ئامرازی کاری نیە، تەنیا کاری لەسەر دەکا و سێ یەکی داهاتەکەشی پێ دەبرێ.

۶۱) (ظاهرا " قەلاتاو " مثل " کەرەتاو " درست است . قەلاتاو یعنی " قلع‌تاب" تابندگی و درخشش فلز قلع کە درساختمان زرە یا سلاح دیگر بە کاررفتە بودە.) ـ لەتەوزیحاتی مامۆستا قادر فەتاحی قازی ـ

**■ حەکیم**

## دیاری

پەپوولەی خۆشی دای لە باڵ ، فڕی
نەو بەهار یەخەی سەوزی دادڕی

کاتێ سەر پەنجەی چڵکنی دوژمن
ناخی جگەری شاری هەڵدڕی

«شنروێ»[1] تاجی پیرۆزەی سەری
داکەند و ، گوڵی خەندەی هەڵوەری

کراسی رەشی تۆخی پرسەیی
بێ بەزەییانە کرایە بەری

«بالانبو»[2] غەمگین ٠٠ بێ کەیف و سوور
چاوی ئەرێژێ نم نم ئەشکی سوور

هەناسەی گەرمی بۆ کڕووزی شار
ئەکا بە دیاری دەشتی شارەزوور

«ئەحمەاوا»[3]و«گولان»[4] ، «وەزگێل»[5]و«سەرکەن»[6]
خۆش و باسەفا ، چوار بەهەشتۆکەن

ئێستە دڵتەنگن ، زیز و پەرێشان
کەوتنە بەر هەڵپەی رقی ئەهریمەن

زامێکی قووڵ و ناسۆر کەوتە دڵ
کە بای نەمان هات دای لە پەڕەی گوڵ

خەندەی شەش هەزار خەڵکی بێ تاوان
بێ ناز دوژمنم خستنیە ژێر گڵ

تۆ خوا مەولەوی لە ملەی«مزیار»[7] ،
نیگایەکی گەش بگرە چاوی شار

ئەم سەرتا ئەو سەر سەیری بکە چۆن
بۆتە گۆڕێکی گەورەی تەنگ و تار

تایەر بەگ هەڵسە یەرووی نازەوە
بە چاوی شێعری پڕ لە رازەوە

بۆ سەرە مەرگی شارە جوانەکەت
غەزەلێك رێکخە بە ئاوازەوە

ئەحمەد موختار جاف شاعیری میللەت
خاوەنی دەنگی بە سۆز و هەڵمەت

بۆ کۆستی گەورەت شێعرێك هەڵبەستە
شێعرێ نەك وەکوو جەرگی شار لەت لەت

تۆش فەرموو گۆران سەرێك هەڵبڕە
بە ؤکی پەڕی شێعرێك دادڕە

قافیە زۆرە و رووداویش گەورە
بەرگێ بۆ بالای بووکەکەت ببڕە

ئەو بووکە شەنگەی خەم دەوری تەنی
بە نالەی بۆمبا دڵی راچەنی

غازی کیمیاوی خوێنی شەش هەزار
رۆڵەی ئازیزی رشتە دامەنی

---

١ و ٢ = دوو چیای دەوری هەڵەبجەن
٣ و ٤ و ٥ و ٦ هاوینە هەوارەکانی شارن٠
٧ ـ ملەیەکە لە پشتی گوندی پریس کە ئەڕوانێتە شار و مەولەوی لەویا بولبولی گیانی لە چریکە کەوت٠

**ب.برياجی**

نەداری وەك چەمۆڵەیە،
کە دڕك و داڵی نەزانی
ڕۆ دەکاتە چاوی بەشەر
ڕەشە هەورێکی بەسامە
کە بارانی دەرد و کەسەر
لێی دەبارێ و دەرژێتە سەر
هێڵەکانی* زەوی ژیان
لەوێ لە قاقڕی بەدەر
هیچ بەر هەمێ نایێتەبەر

بە دەستی ڕەشی هەژاری
بە دەربەداری و بەرەنجی
نوقمی گێژاوی ژاکانە
گۆلی پڕ ئاواتی گەنجی
دنیایەکە... کپ و تاریك
مەکۆی گریە و هەناسەیە
گۆڕستانی پڕ لە گڵکۆی
ئاواتی گەش و تاسەیە

## بم بم لەگەڵ...

**■ حامید خاکی**

رووبارەکە زۆر تکایە منیش بەرە
دەمێکەیە چاوەڕوانم لەم بنارە
ئەگەر نەم بەی
یا دەسووتێم
یا لەشکری خەمەکانم دێن و ئەم دەن لەقە نارە
رووبارەکە با نەسووتێم
بالەشکری خەمەکانم ئەگەر هاتن نەم دۆزنەوە
منیش بەرە
دەنا لە هەر قوژبنێکا خۆم وەشێرم ئەم قۆزنەوە
منیش بەرە
بە بناری کێوەکانم بناسێنە
بە دەم ڕێگەی ژیانەوە ، بە پێچ و خەم
بە هەوراز و نشێوانم بناسێنە
بە وێنەی مانگ
لە ئاوێنەی گۆمی مەنگدا بم ناسێنە
بە خوڕەی ئاوەخوڕێنەکەت
لە بێدەنگی شەوەزەنگدا بم ناسێنە
بە گاشە بەردی بەر لێوار
بە گەنم و جۆ ، بە بەرد و دار
بە پێمە ڕەی دەستی ئاویار
بە گوند ، بە شار
بە هەر چیەك لە سەر ڕێتا
بم ناسێنە
بمبە لە گەڵ
بە هەر چیەك بە بەر پێتابم ناسێنە

**■ خدر حەسەن بێورەیی**

## خاسەکەوێ

گۆوارەکەی خۆش وەك بلوێر
سروەی شادی گوند و بازێر
سڵاو بۆ تۆو نووسەرانت
بۆ ئاواتی بەرز و جوانت
پیرۆزت بێ موژدەی شەفەق
رووناکتر بێ ڕێی ڕاست و حەق
تۆ فەرهەنگی کورد پارێزی
قەڵای پتەو مەتەرێزی
چاوی گەشی کورد ، بێداری
باوەشێنی ڕێی رزگاری
هەرگیز لە دڵ مەگرە غەمێ
لاوی کوردم هەر دەتگەمێ
فێرم بە هەوراز و لێژان
هاوڕێی بەرزی بەیت بێژان
هەڵدێی وێڕای مانگە شەوێ
پێش خۆر هەڵات خاسەکەوێ
دێنی موژدەی کوردەواری
هاتەوە سروەی بەهاری

# رێنـــوێنی ئەدەبی

**پیرانشار : کاک سولەیمان ئەحمەدی**

**پاش سڵاو**

ئەو دەم کە شێعری بەهاری جەنابت گەیشتە دەستمان • گەڵا شینەکانی بەهاری زەرد و سیس هەڵگەڕابوون و بە ئاستەم و دووبەڵا خۆیان بەلکەکان هەڵپەساوتبوو کە ها ئێستا ، ها تاوێکی دی بوەرنە بەر پێی ڕێبواران و لە تافی جوانی و سەر سەوزیان جگە لە بیرەوەری هیچیان پێ نەمێنێ • زۆرمان پێخۆش بوو هەتا ساڵێکی دی کە کاروانی شێعری بەهاری سروە دەگەڕێتەوە ، دیمەنە بە شێعر کێشراوەکەی تۆش ڕاگرین و دەگەڵ ئەو کاروانە لە هەواری تایبەتی دا چادر و چیغی بۆ هەڵدەین و ئەستوندەکی بۆ بچەقێنین و بیخەینە بەر چاوی هەواردۆست و هەوارچیان بەڵام چبکەین کاروانی شێعر وەک گەڕی داوەتێ وایە و هەر کەس نەتوانێ دەگەڵ ئاهەنگی چۆپی هەڵسووڕێ و هەنگاوی ڕێك و پێك نەبێ لەو ریزە دەبێ دەرکەوێ و سەیریان بکا هەتا خۆ فێری ئە و ئاهەنگە بکا و جارێکی دی خۆ بە تاقی کاتەوە • ناهومێد مەبە • هەر چەند ئەتۆ نەتتوانی دەگەڵ کاروانی ئەو ساڵ بەرە و هەواری ساڵی دی هەنگاو بنێی بەڵام ئەو کاروانە قەت ناوەستێ و دێ و دەچێ هەتا ئەتۆ و سەدانی وەکوو تۆ ڕەگەڵ خۆی خا •

**پیرانشار : کاک محەممەد ئاسوود**

• شێعری " نوێ " ی جەنابت بە دەستمان گەیشت • ڕەچاو کردنی قافیە لە شێعری نوێ دا پێویست نیە ، بەڵام شێعری نوێش وەزنێکی تایبەت بە خۆی هەیە کە ئەگەر ئەو وەزنە هەتا ئاخر ڕەچاو نەکرێ شێعرەکە لەنگ دەبێ • بۆ وێنە بەشی دوایی شێعرەکەی تۆ ئاوا نووسراوە :

تۆ لە دونیای خەیاڵمدا
وەك ئەستێرەی گەشی شەوی
وەکوو چرا لە تاریکی
ئەدرەوشێی و ناکووژێیتەوە •

کە " ناکووژێیتەوە " وەزنی شێعرەکەی ئاڵۆز کردووە چونکە تەواوی میسرەعەکانی دیکە هەشت هیجائین،بەڵام ئەو میسرەعە هەشت هیجایی نیە • دیارە کە شاعیر لە شێعری ئاوادا دەتوانێ لە چوار ، هەشت ، دوازدە و ••• هیجایی کەلك وەرگرێ • سەر کەوتووبی •

**سەقز : کاک ئەحمەد ڕەشید زادە**

شێعرە بە سۆزەکەتمان پێگەیشت • هێندێك جێگای شێعرەکەت کەم و کووڕی هەبوو • بۆ وێنە بڕوانە ئەو بەیتەی خوارەوە

شاری کز و مات دڵ غەمگینئەکەم
شاری زوڵم لێچووی بێ هاوارەکەم

لەو بەیتەدا " هاوار" و"غەمگین " کراونەتە قافیە کە هەڵەیە • هەر وەها لە بەیتی دوایی دا نووسیوتە :

کێو و دار و بەرد ،چیا و دەرودەشت
هەموو ڕەش پۆش و تازیت بارن گەشت

بە کار بردنی وشەی گەشت لەو جێگایە دا بێ مانایە و دە بوایە لە وشەی " گشت " کەلك وەرگری و فکرێکیش بۆ قافیە بکەیەوە • بەیتەکانی دیکە بێ هەڵەن وەك ئەو بەیتە :

دیسان بەختی ڕەش قودرەتی نوان
کوشتی منداڵ و لاوانی زۆر جوان

سەر کەوتوو بی •

**مهاباد : کاک سەعید شەریفی**

**پاش سڵاو**

ئەو شێعرەی بۆ ئێمەت ناردبوو لە باری وەزن و قافیەوە کەم و کووڕی زۆر بوو• زیاتر بخوێنەوە و زۆرتر خۆت بە شێعری شاعیرانی پێشوو وە ماندوو بکە هەتا شارەزاییەکی زۆرترت بە سەر ناسینی شێعردا هەبێ • شاعیری هێندەش سووك و هاسان نیە • زیاتر هەوڵ بدە •

**مهاباد : کاک ڕەزا ئەمینی**

شێعر و نامەکەت بە دەستمان گەیشت • بە داخەوە شێعرەکانت زۆر کرچ و کاڵن•بۆ ئەوەی پوخت و پاراو بن دەبێ زۆرتر هەوڵ بدەی •

**مەرەند : کاک ئەحمەد فەقێ ئیسماعیلی**

پاش سڵاو و سوپاس لە پێوەندی و هاوکاری یەکەت شێعرەکەت لە چەند جێگادا کەم و کووڕی هەیە • بۆ وێنە ئەو بەیتەی خوارەوە هەم لە باری وەزنەوە لەنگە و هەم قافیەی نیە :

ئەو خولایەی کە فەرمانی قەهری بە بای دا
وا قەومی عادی وەژێر خاکان دا

دیارە کە مەسرەعی دووەمی شێعرەکەت زۆر کورت ترە و دەگەڵ میسرەعی یەکەم یەك ناگرێتەوە لە باری قافیە شەوە " دا" دەبێتە ڕەدیف و " خاکان " و " بای" دەبوایە قافیە بن کە هەڵە یە • لە چەند بەیت خوارەوەتردا دەنووسی :

یەکێ دەپووشێ فاسوونیا و حەریر
یەکێ نابینێ قەت نان و پەنیر

ئەو بەیتە لە باری سنعەتی شێعری یەوە بێ هەڵەیە • بەڵام لە باری ماناوە تازە نیە و لە موناجاتی زۆرشاعیری دیکە دا نووسراوە • زیاتر هەوڵ بدە •

سەرکەوتووبی •

**پیرانشار : کاک کەریم ئاسوود**

شێعرە کلاسیکەکەت جوان و بێ هەڵەیە بەڵام شێعرە نوێ یەکەت بۆ چوونی هەڵەی زۆر تێدایە و دیارە کە لە کاتی نووسینی شێعرەکە دا تەنیا وەزنت لە بیر بووە و لە ماناکەی ورد نەبوویەتەوە • بۆ وێنە: ئەو خۆشەویستی یە کە دەتوانێ لە نێو خوێن و ڕەگ و دڵی ئینسان دا جێ بگرێ•ئەگەر ئینسان عاشقی شتێك بێ و ئەو ئەوینەی بگاتە ئەو پەڕی خۆی دەڵێ ئەو •••ئەوە ئەدەم خۆش دەوێ کە لە نێو خوێن ودڵی مندا ریشەی داکوتاوە • بەڵام ئەتۆ دەڵێی :

ئەی دوژمنی لە مێژینەم
لە ناو دەستمی ، لە سینەمی
لە ناو هەر قەترە خوێنمی

کە بۆ چوونێکی هەڵەیە و وا دەگمێنی کە دوژمنە لە مێژینەکەت لە نێو دەستت دایە بەڵام ئەتۆ هیچی لێ ناکەی و تەنانەت ڕێگات داوە هەتا تێکەڵی خوێن و گیانیشت بێ . یا لە چەند دێڕ خوارەوەتر دا نووسیوتە :

وجوودی جوان و بۆگەنت ...

ئەو دێڕەش بێ مانایە . چونکە جوانی و بۆگەنیوی دووسیفەتی دژ یەکن و ناتوانی لە پێهەڵکوتن دا بڵێی : ئەی جوانی بۆگەنیو ...

هەوڵ بدە زیاتر لە مانای شێعرەکانت ورد بیەوە . شێعری بێ مانا وەك گوێزی بێ تۆکڵ وایە . سەرکەوتوو بی .

**سەقز : کاك مستەفا محەمەدی**

برای بەڕێز : نامە فارسی یەکەت و شێعرە کوردی یەکەت بە دەستمان گەیشت . لە مەڕ نووسینی کوردی داوای ڕێنوێنیت کردبوو . لە شێعرەکەت را (کە بە زمانی کوردی نووسرابوو ) دەر دەکەوێ کە تا رادەیەك شارەزاییت بە سەر نووسینی کوردی دا هەیە و دەتوانی بە نووسینی مەشق لە رووی نووسراوەی کوردیشەو کەم و کووڕی یە لە نێو ببەی . شێعرەکەت جوانە و ئەگەر درێژە بە کارەکەت بدەی بە هیوای خوا لە داهاتوویەکی نیزیك دا شێعرەکانت لە لاپەڕەکانی شاعیرانی لاو دەگونجێن .

ئەوەدوو بەیت لە شێعرەکەت دەخەینە بەر چاوی خوێنەران :

سڵاو پێنووسم ، سڵاو هاودەمم
سڵاو رەفیقی دنیای ماتەمم
بینووسە پێنووس هۆنراوەکانم
قەت ماندوو نەبی دەردت لە گیانم

سەرکەوتووبی

**شنۆ : کاك ئەییووب مێهدی زادە**

وێڕای سڵاوێکی گەرم و گوڕ نامە و شێعرەکەت گەیشتە دەستمان . ئەوە چەندەمین نامە و شێعری تۆی بەڕێزە کە دەگاتە دەستی ئێمە . خۆشحاڵین لەوەیکە پێوەندیت دەگەڵ ئێمە ناپسێنی و لە هاوکاری یەکەت دا بەردەوامی . شێعرەکانی پێشووت کەم و کووڕییان زۆر بوو . بەڵام خۆشحاڵین کە ڕێنوێنی یەکانی ئێمەت لە بەر چاو گرتووە و توانیوتە تا رادەیەکی زۆر پلەی شێعرەکانت بەرێە سەرێ . بەڵام لە نووسینی کوردی دا هەڵەت زۆرە کە پێویستە بە موتاڵای زۆرتر ئەو هەڵ نەش چاك کەیەوە . ئەوە چەند بەیت لە شێعرەکەت دەخەینە بەر چاوی خوێنەران:

ئاخۆ ئەتوانم ئەمشەو
ژانم بە جۆرێ چار کەم
باڵ بگرم هەر وەکوو کەو
روو لە لای کۆشکی یار کەم
ئەترسم باڵ و پۆپم
لە ئاسمانی کەش و ئاڵ
یەك لە دوای یەك هەڵوەرن
ژین کەن بە خەون و خەیاڵ

---

**نامەو دیاری ئەو ئازیزانەشمان بە دەست گەیشتووە ولە لایەن بەرپرسانەوە و راوێژنیار ورەخنەکانیان لە دەفتەری تایبەتی دا نووسراوەتەوە ولە گەنجینەی فەرهەنگ وئەدەبی ئەو ناوەندەدا هەڵگیراوە وێڕای سوپاس لە ئێوە هاوکارانی بەڕێز چاوەڕێین هەتا ئەو پێوەندیە پتەوترکەن ولە مەودوا سروە بە دیاری یە جوانەکانتان برازێننەوە.**

**سەردەشت :** سمایل خدری ـ ئیبراهیم مستەفا ـ سەعید رەحمانی ـ خالید جووتیار ـ ئیسماعیل خدری ـ ع.م ـ رووبار ـ عەلی محەمەدی ـ عوسمان عەلیزادە ـ مەحموود حوسێنی ـ شاکر سەردەشتی ـ کەریم خدر زادە ـ حەدادی ـ بەختیار حەسەنی ـ خالد جووتیار ـ ئەمیر مەلکاری .

**بۆکان :** محەمەد سولەیمانپوور ـ عەبدوللا ئەییووب زادە ـ محەمەد سولەیمان پوور ـ ناسر باباصیری محەمەد ئەمین رەحیمی ـ عەبدوللا رەمەزانی ـ محەمەد تازە قەڵعەکی ـ کەمال ئەحمەد ـ ئەبووبەکر رەحیم پوور ـ محەمەد فارووق فووجی ـ عەزیز دەیلمی ـ کەماڵە ددین کەریمی ـ حوسین حەسەنی ـ سمایل قاسمی ـ محەمەدرەسوول مەلایی ـ ئیسماعیل قاسمی ـ رەسوول خدری ـ حامید نیعمەتی ـ عەلی ئەحمەدی ـ سەعید رەمەزانی ـ لوقمان نەجاری ـ عەودولخالقی یەعقووبی ـ ئەنوەر نوور محەممەدی ـ نادر نیروومەند ـ عەلی ئەمین و عوسمانی مەناف پوور ـ سەلاحەدین فەتاح ـ کەمال کارکەر .

**شنۆ :** خوشکە مەریەم ئەدیب زادە ـ عەبدوللا ئەحمەدی ـ جەمیل ئاسو ـ سەلیم یووسفی ـ محەممەد ئەدیب زادە ـ حەسەن رەوەندی ـ سەلاحەدین عەزیزیان ـ کەمال نابووس ـ ئیبراهیم مورادی سەلاحەدین ماوەتی ـ فەتاح ئەحمەدی ـ محەمەد سەلیم چایی ـ عوسمان شوکری ـ هیوا ئەمینی ـ حایل قادری ـ خوشکە مەریەم ئەدیب زادە ـ موزەفەر مەهدی زادە .

**سەقز :** ئیبراهیم بازیان ـ عەبدوللا وەکیلی ـ جەمال توپچی ـ ئەنوەر غەفووری ـ نافع مەزهەری ـ جەعفەر محەممەدی ـ سەید کامیل حوسێنی ـ کاوە کولکار ـ مەحموود خالدی ـ خالد حەسەن زادە ـ فاتیح حەیدەر نژاد ـ محەمەد شافیعی ـ جەمال رەعدی ـ محەمەد نافیع عەلائی ـ عەبدولکەریم رەزاقی ـ عەبباس کەریمی ـ شاهۆ ز.ی ـ مەحموود قادر ئاوارە ـ زاهد ئازمی ـ کەریم گەنجعەلی پوور ـ خوشکە شەهناز رەحمان پوور ـ محەمەد کەریم .

**پیرانشار :** عەلی مەولوودی ـ حەسەن بایەزیدی ـ عوسمان پەراکەندە ـ محەمەد شەریف زادە ـ سەعید عەبدی ـ عەبدولقادر بەرزەنجی ـ ئبراهیم یووسفی ـ محەمەد وەسیمی موحەسیلی ـ کەریم ئاسوود ـ مەلا عوبەیدیلا . عەبدولکەریم بایەزیدی ـ حوسێن ئەمینی ـ مەلا قادر پیرە میرد ـ سەید ئیسماعیل سەیید شوکری ـ سەید حەسەن و سەید ئەحمەد بەرزەنجی ـ رەحمان عەبدوللا پوور ئازەر ـ سولەیمان مودەرسی .

**سنە :** نیعمەت کارگاهی ـ حەبیب وللا شاه مورادی ـ زەبوون ـ خالید ئەحمەدی ـ خالید پەشیو ـ حامید مودەرس گورجی ـ ئەنوەر رەوشەن ـ ئیسماعیل مەجیدی .

# سەیرانێکی کورت بە جیهانی هونەری منالاندا

**فاروق سەفی زادە**
**(بۆرکەیی)**

هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری منداڵ بە تایبەت لە باری وێنە ونیگارەوە، کە دەگەڵ چاوکردنەوەی، دەست پێ دەکا، باسێکی گرینگە وبیر و را لەم بارەوە زۆرە. چۆنیەتی پەروەردە کردن و بارهێنانی منداڵ لەو ڕێبازەدا، ئەرکێکی زۆر گرینگە.

ئەگەر لە سەرەتای منداڵی-یەوە، بۆ چوونێکی دروستمان لە منداڵ هەبێ و بارهێنانی دروست بێ، زەوق وباری هونەری منداڵ هەر لەو سەردەمەوە دیاری دەکرێ.

**دە ورانێکی سەیروسەر سوڕهێنەر :**

بەرلەوەی لە دونیای سەیری منداڵی وردبینەوە، پێویستە بە چاوێکی توێژکارانە و زانایانە بڕوانینە منداڵ.

ئەگەر بە وردی بڕوانینە هەردوو دیمەنی دەرەوە( ظاهر ) و دەروونی ( باطن ) منداڵ بۆمان دەردەکەوێ کە هەزاران مەبەستی سەرنج ڕاکێش لە دەروونی هەر منداڵێکا - هێندێك دیاروهێندێکیش نادیار - خۆیان حەشارداوە.

جابۆیە دنیای منداڵی دەورانێکی سەیروبەربڵاوە وهەر لەم ڕوانگەوە، زانایان وروان ناسان دەروانـنە دەروونی منداڵ و هەر ئەو شوێنەش لە داهاتوودا درێژەی دەبێ.

ئەگەر دایك وباوك لە ماڵێ و ماموستایان لە قوتابخانە بتوانن دەروونی منداڵ بدۆزنەوە ودەخووخدە و ئاکاری منداڵ بگەن، هەردوولا (منداڵ - ئەندامانی دەوروبەری منداڵ)، دەتوانن بە یەکەوە بەرەو ژیانێکی دروستهەنگاو هەلێننەوە.

لە ئەنجامی ئەم تێبینیانەدا بۆمان دەردەکەوێ کە منداڵ ڕاستەوخۆ، سەرچاوەیەکە بۆ فێربوون وفێرکردن.

**ئاواتێکی دەروونی :**

منال پەپوولەیەکی گوڵزاری بەهاری ژینی دڵکێش و ڕەنگینە. منداڵ دەیهەوێ لە نهێنی یەکانی ژیان وسروشت ودەوروبەری خۆی بگا وهەروەها دەیەوێ لەدەروونی خۆی وهاواڵ وخوشك و برا و دایك وباوك وماموستاکانی بگا.

هەربەوهۆیە دەڵێن منداڵ خۆی هونەرمەندێکی بەسەلیقە ولێهاتووە.

کاتێك ئەم بەرهەمە چەقەرە دەدا و پەل بڵاو دەکاتەوە کە ڕێگای تایبەتی خۆی بۆ دیاری بکرێ وجا ئەمحارە ئاکامێکی باش وجوانی دەبێ.

ئاکار و بزووتنەوەی منال پێشاندەری وێنەی خەیاڵی وی یە.

بۆ وێنە ئەگەر توانی شتێك بە دەستەوە بگرێ هەلێدە سووڕێنێ، هەڵیداوێ و.... یا دەنگی سەیردەردێنێ دەقیژێنێ و... بەم جۆرانە هەستی دەروونی خۆی دەردەبڕێ وئاوات وئارەزووەکانی خۆی بەشکلی وێنەیەك لە ئاکاری خۆی دەردەبڕێ.

دەتوانین بڵێین هەربەم شێوە، منداڵ لەو کاتەوە چاو دەکاتەوە، بە هەمە ڕەنگ پێداویستی و ئارەزووی دەروونی خۆی دەردەبڕێ و بە پێی زیادبوونی تەمەنی حاڵەتی ئەم ئاکارانە دەگۆڕدرێن.

**پێوەندی منداڵ دەگەڵ دەوروبەری:**

منداڵ لە هەموو شتی دەوروبەری خۆی ورد دەبێتەوە دەیهەوێ لە ناخی هەموو شتێك بگا و نهێنی یەکان بدۆزێتەوە.

سازکردنی خانووچکە، سازکردنی شتی سەیر بە کاغەز و چیلکە و گەڵا وگوڵ وشە مچە و....، شتێکی تەبیعی یە

هەرلەم ڕێبازەرا، دەبێ کەرەسەی یاریکاری بەپێی تەمەنی منداڵ بۆی هەڵبژێر- درێ. ئەم کارەش دەبێتە هۆی پەروەردە بوونی زەوقی هونەری منداڵ.

هەروەها بردنە دەری منداڵ بۆ گەشت و سەیران و دیتنی دیمەن و وێنەکان، بۆپەرەگرتنی توانای هونەری منداڵ بەجێیە.

**سەرەتای وێنەگەری منداڵ:**

کاتێ منداڵ خوشك وبراکانی دەبینێ کە قەڵەم ودەفتەریان بەدەستەوە و خەریکی نووسینەوە و وێنەکێشانەوەن پەلاماری قەڵەمەکانیان دەدا و دەیەوێ وێنەی دونیای تایبەتی خۆی بکێشێتەوە. بە پێکەنینەوە، ڕاست وچەپی خەت دەکێشێ ولە خۆشیان هەڵدەبەزێتەوە. ئەگەر قەڵەم ودەفتەری لەبەردەست نەبێ، دارودیوار خەت دەکێشێ

جا لەبەر ئەوەی ئاواتی منداڵ سەرکوت نەکرێ وبەهرەی پیرۆزی زیندە بەگۆڕ نەبێ پێویستە کەرەسەی پێویستی بدرێتێ تا هونەرەکەی گەشە پێ بدا.

**بابەتەکانی وێنەگەری منال:**

لە رابردوو دا، زۆرجار بە هۆی نەناسینی هەستی خاوێنی دەروونی منداڵ ئەم زەوقەی منداڵ سەرکوت کراوە وسەدان هونەرمەند بە ناکامی سەریان ناوەتەوە.

ئازادی کاریان بە منال نەدەدا ئەگەر داباشیان، لە چوارچێوەیەکی بەستراودا بوو کە منداڵ مەودای فیکر کردنەوە و دەربڕینی هەست و زەوقی خۆی نەبووە.

جێی داخێکی زۆرە کە ئێستاش لە زۆربەی قوتابخانەکان ئەم کارە هەر ماوە و بایەخی واقیعی بە هونەر نادرێ، بەڵکوو هونەر بە سووك دەگرن...

کار لە سەر منداڵ بۆپەروەردە کردنی لایەنی هونەری دەبێ بەردەوام بێ، دەبێ کادری هونەری زیاد بکرێ و لە هەموو چەشنە کاری هونەریداهاوبەشی بکات. بایەخی تەواوبە هونەر بدرێ، چونکە هونەر ئاوێنەی ژیانە.

ژیانی رۆژانەی منداڵ وەك لەخەو هەستان، نان خواردن گەڕان، پێوەندی دەگەڵ دەورو- بەر هۆنراوە و چیرۆکی منداڵان و... بۆ وێنەگەری منداڵ زۆر سووژەی باشن.

ئەوەشمان لە بیر نەچێ ئەگەر منداڵ ویستی بەداخواز وئارەزووی خۆی وێنەیەك بکێشێتەوە، نابێ بەرگری لێ بکرێ.

**دانی ئازادی بە منداڵ:**

ئێمە لە ژیانی رۆژانەی خۆماندا هەڵس وکەوتی زۆرمان لەبەرە. کەسیش نیە لەم ڕێبازەدا ڕێنگامان پێشان دا. ئەو مەبەستە بۆ منداڵانیش لەبەرچاوە منداڵ ناتوانێ بە وتە بێزاری خۆی دەربڕێ، لە دەروونیدا دەمێنێتەوە هەر بۆیە ئەگەر دەست لە کاری منداڵ وەردەین دەروونی بریندار دەبێ و لە کارەکانی دڵسارد دەبێتەوە.

منداڵ وەك سەرچاوەیەك وایە کە ئەگەر زۆر دەستکاری بکرێ وردە وردە ویشك دەبێ

بەلام ئەگەر لە سەرچاوەکەیەوە خاوێن بکرێتەوە، ئاوەکە خاوێن وجوان دێتەدەر ودرێژە بە رێگای خۆی دەدا.

**هەڵسەنگاندنی بەرهەمی منداڵ :**

گەلێ راست ودروستە کە گوتراوە دەردەدار بە دەردیخۆی دەزانێ... لە مەوبەر هەربەش و پارچەیەکی وانەی* هونەر بە دەست مامۆستایەکەوە بوو بەم چەشنە مامۆستایەکی تایبەتی بۆ هونەر تەرخان نەکرابوو تابتوانێ زنجیرەی سەرەتا وکۆتایی ئەم مەبەستە رەنگینە بەیەکەوە ببەستێ. یا هێندێك لە مامۆستایان ئەم وانەیان بە دەرفەت زانیوە بۆ حەسانەوەی خۆیان و سەرکوتکردنی منالەکان.

ئەرکی مامۆستاکان ئەوەیە کە منالەکان هان بدەن کە بتوانن رۆژ بەرۆژ باشتر خۆ بنوێنن.

بەم چەشنە تووی هێز و توانای باوەڕ بە خۆکردن لە دەروونی منداڵ دا دەچێنرێ وهەست بە سەربەخۆ بوون دەکا.

**هەندێ چیرۆك لە وێنەی منداڵدا :**

ژیانی مرۆڤ وەك چیرۆکێکی شانۆیی وایە.سەردەمی منالێش خۆشترین وجوانترین بەشی ئەم شانۆیەیە کە پڕە لە خەونی سەوزو ئاڵ،پڕە لە کاتی شیرینی سەردەمی دونیای منداڵی .

سەرەتای ژیانی منداڵ پڕە لە سەرنج و تۆمارکردن. لەو سەردەمەدا منداڵ وەك تۆمارێکی ئەلکترۆنی.هەموو شتێك وەردەگرێ و ژیانی منداڵی لەم سالانەوە دەس پێ دەکا.

باوکێکی هونەرمەند گێڕایەوە:

منالەکەم. کە تەمەنی سێ ساڵ ونیوە، خەریکی یاری کردن بوو، لە پاشان وێنەیەکی کێشاوە و گوتی:

- ئاها بابە، وێنەی تۆ و دایکم کێشاوەتەوە.

کاتێ سەرەنجمدا ،دیتم زۆر خەتی تێکەڵ وپێکەڵی کێشاوەتەوە منیش ئافەرینم پێ گوت و ماچم کرد.

پاشان دیتم خەریکە بە قەڵەم وێنەکە خەت خەتی دەکا. کاتێ هۆی ئەم کارەم لێ پرسی.

وەلامی دامەوە :

ئاخر تۆ زۆرجار تووڕە دەبی وبە توندی بە سەرمێزەکەی دادەدەی .

منالێکی تر، خەتی جۆرا جۆری کێشاوەتەوە و دەلێ ئەمە وێنەی ئەم بالندانەن کە لە باغ دیتوومن و هەریەکەی نێوێکیان لەسەر دادەنێ .

لە جێ یەکی تر هێندێ منال قەلەم بە دەست،دەفتەرەکەیان خەت خەت دەکەن و دەلێن وێنەی یەکتر دەکێشینەوە.

ئەورۆکە هەلێکی زۆر باش بۆمندالان پێك هاتووە کە ئەگەر بتوانن کەلکی لێ وەرگرن . داهاتوویەکی رووناکیان لەبەرە .

قوتابی یەکی پۆلی یەکەمی سەرەتایی تەماشای وێنەکەی کە کێشاویەتیوە دەکاودەلێ:

لەناو ئەو باخ ودارستانەرا پیاسە دەکەم .

کیژۆلەیەك زماوەند و بووك گواستنەوەی گەرەکی خۆیان دەکێشیتەوە وبە پێکەنینەوە دەلێ :

نوقل ونەبات بەسەر بووك دا هەلداوێن .

بەم چەشنە لەم جۆرە چیرۆکانەدا هەمووهەستێك لە ناخی منالەوە سەرهەلدەدەن وبە شێوەیەکی دروست پێوەندی نێوان سروشت ودەوروبەر ودەروونی منداڵ دەردەخەن .

بێ گومان ئەگەر مندالەکانی ئێمەش لەم رێبازەدا سەرپەرستیان هەبێ، لە داهاتوویەکی نیزیك دا دەبنە خاوەنی قوتابخانەی هونەری تایبەتی خۆیان و دەگەڵ کاروانی هونەری مندالانی جیهان بەرە وپێش دەڕۆن .

لە کۆتاییدا دەلێم کە ئەم باسە بۆ نیشان دانی مەبەستێکی گرینگ وچارە سەر کردنیەتی ،هەروەها دەرگا ،بۆ درێژە پێدان وتۆژینەوە و فێر کردنی لە لایەن زانایانەوە ئاوالە دەکاتەوە.

سالی ١٣٢٩ هه تاوی تاقمێك چه ته له له دێی بانه زێو، ناوچه ی سه رده شت ده گه ڵ سه ید فه تحولڵا نۆکه ری حه مه دی ئاغای " لێلانه " به شه ڕ هاتبوون . له و شه ڕه دا سه ید فه تحولڵا لاقی ده شکێ و ماوه ی چوار مانگ ده جێ دا ده که وێ .

زۆرجار دوکتۆری خۆماڵی ده رمانی ده که ن به ڵام چا نابێته وه ، فه قێ ساڵحی شه رگه سه ید عه ولای برای ڕێنموونی کردبوو ، هاته " سه به تلوو " که من ده گه ڵ خۆی به رێ . پاش تکا و ڕه جایه کی زۆر هه ستام ره گه ڵی که وتم . کاتێك گه یشتمه " لێلانه " سه ید فه تحولڵایان به داره مه یت هێنا لای من ، چه ند رۆژێکم ده رمان کرد چاك بۆوه . دوای ئه و نه خۆش ئه وه نده زۆر بوو بۆ ماوه ی مانگێك فریای چوونه وه نه که وتم . جاری وا بوو نانم پێ نه ده خورا .

رۆژێك کابرایه ك به ناوی سه ید مه نسوور خه ڵکی ( ماوه لۆ) هاته لای حه مه د ئاغای " لێلانه " کچێکی نه خۆشی بوو هێنای بۆ لای من و قسه کانیان به م جۆره ده ست پێکرد :

-" حه وت ساڵه نه خۆشه . مردووه به ڵام نانی زیندوان ده خوا ، ماوه یه ك له مه و به ر به یارمه تی هێندێك له براده رانی ئه و دیو ناردم بۆ سوله یمانیه ، شه ش مانگ له خه سته خانه ماوه به ڵام بێ فایده بوو . دوکتۆره کان چاره یان نه کرد ، له وێرا ناردیان بۆ که رکووك ماوه ی ساڵێکی ته واویش له وێ ماوه سه رت نه یه شێنم چاره ی نه کرا ، دۆستان وه ڵامیان دامێ چووم هێنامه وه بۆ ئێران .

له ئێران بردم بۆ لای شێخ ئه مین بێژوه یی .

گوتم : " قوربان ئه و دیاریه م بۆ جه نابت هێناوه . دیاره پاش خوا تۆ به منت داوه ( سه ید مه نسوور هێنده باوه ری به شێخ ئه مین هه بوو وایده زانی کچه که ی خوا پێداوی ئه وه . )

شێخ فه رمووی بیبه وه بۆ ماڵێ ،خۆت خزمه تی بکه قه ولت پێ ده ده م چاك

**به سه رهاتی سه ره وه مان له لایه ن میرزا محه مه دی ره فاعی یه وه که پزشکیکی خۆماڵی یه پێکه یشتووه که خڕ و پته و بڵاومان کردووه ○**

# ده رمانی خۆماڵی

ده بێ ، ئه منیش چون زۆرم باوه ڕ پێی بوو به دڵنیایی هێنامه وه ماڵی خۆمان. دوکتۆره کانی ئه و دیو گوتبوویان تا ئێستا نه خۆشی وامان نه دیوه هیچ جێگایه ك له له شی ناجووڵێته وه، پێڵووی چاوی زه رد بووه،ددانی لێك توند کردوون ، ده نگی نایه و نه خۆشیه که ی ناناسرێ. به ڵام من پێم وابوو شێخ له غه یبه وه پێی گوتراوه چا ده بێ.

حه مه د ئاغا گوتی :

-" سه ید مه نسوور زۆر فه قیره ده بێ زۆر باش چاو له نه خۆشه که ی بکه ی.

هه ستام چووم کچه م موعاینه کرد به ڵام هیچ شتێکم له نه خۆشیه که ی نه زانی ، چۆنه تی نه خۆشیه - که م له دایکی پرسی :

-" دایه گیان ئه و کچه چۆن بوو وا نه خۆش که وت ؟"

-" ماوه یه ك بوو به مێردمان دابوو ، به ڵام هێشتا ماره کراوی کابرا بوو ، نه گوێزرابۆوه ، رۆژێك باران باری کانی یه ك له پشت ماڵانه ، چووبوو خاوێنی کاته وه ، وه ختایه کی هاته وه هه موو گیانی ده به ر ئاو ێ دابوو وه ك مێوژۆکه ده له رزی. چه ق و چۆی ددانی بوو و ئه منیش خێرا جلکه کانم له به ر داماڵی. پاش دو و سه عات ژانێکی پێوه نووسا به نینۆك عه رزی هه ڵده قه ند. ژانه که ی هێدی بوو.ئه وجا ر دوو رۆژ مته قی لێبڕا وده نگ له و دیواره هاتبێ له و کچه نه هات. وام زانی نه ماوه . ئه گه ر لێی خورد بوومه وه به حاسته م ودووبه ڵا هه ناسه ی ده هات ونه ده هات. یه ك دوو که وچکم خوارده مه نی ده گه رووی کرد.

خوارده مه نی ده گه رووی کرد. سه رت نه یه شێنم حه وت ساڵه تووشی ئه و رۆژه ڕه شیه بووینه ، هه رچی هه مان بوو و لێمان خه رج کردووه، کابرا ی بێگانه ش خۆ باب وبرای نیه دڵی پێ بسووتێ ئه گه ر دیتی وایه له باتی هه مو و شتێك ته ڵاقی دا.

پاش قسه ی دایکی بۆ م ده رکه وت که چڵك و چه په ری ئاوه که چۆته نێو له شی و ده بێ به تاڵ کرێ. بۆ ئه و کاره ته ندوورم پێ داخستن لێ گه ڕام هه تا ئاوره که ی دامرکا ، پاشان نه خۆشه که م به کۆنیاك و رۆن زه یتوون چه ور کرد. رووتم کرده وه و خستمه نێو ته ندووره که . به ڵام له جیاتی کورسی له سه ر پووتێکم* دانا و بۆ ئه وه قالبی نه سووتێ سه ری له ده رێ بوو ، گه رما سه نجم نابووه زاری و گلۆێنه شم گرت. پاش ده ده قیقه دلۆپه ئاره قه یه ك له نێوچاوانی وه ده ر که وت له سه ید مه نسوور م پرسی :

-" کچه که ت ناوی چیه ؟

- ئامینه

بانگم کرد ئامین دوا ی حه وت ساڵ گوتی :

-" به ڵێ

دایك وباوکی له خه نی و خۆشیان که می مابوو دڵیان بتۆقێ ، ئامین جار له جا ر چاکتر بوو ، پاش بیست ده قیقه به جوانی وه قسه هات .

سه عاتێك زیاتر له ته ندووردا نه ماوه ، ئازا ی به ده نی ده به ر ئاوێ دا بوو ، ده ستت له هه ر جێگایه کی دابا ده یزانی ، هێنامه ده ری و به دایکی جوان جوان وشکم کرده وه . دیسان له خۆ چوو . سێ ده نگ گۆگجه* م حاز ر کردبوو و نه فه سی مه سنوو - عیشم ده دایه ، گۆگجه که م ده زاری دا تولووخانده وه. به ئاوی گۆگجه فشاری خوێنی هاته سه رێ. پاش حه وت رۆژ نه خۆش به لای لێ بڕا .

له ناوچه ی سه رده شت ده نگی داوه که دوکتۆره که ی " سه به تلوو" نه خۆشێکی مردووی زیندوو کردۆته وه. به قسه ی خه ڵکی له رۆژنامه دا نووسرابوو به ڵام خۆم نه مدی .

به گوێره ی خه به رێ که له خه ڵکم زانیوه ئێستا ئه و کچه شووی کردووه وله شاری سه رده شته و منداڵیشی هه یه .■

# خۆشکە چکۆلەی چاوشینی من...

■ عەلی نانە وازادە

شەو نەبوو ، بەڵام هەتاویش بەئاسمانەوە نەبوو٠ دوو کێوەکان خۆیان دەنواند و لە نێو تەمێکی یەکدەست دا تلابوونەوە*٠ مارێکی ئەستوور و درێژ خۆی لە قەفی دارێک هاڵاندبوو ٠ بێچوو و باڵندەکان زاریان بە دەمای خۆیان داپچڕاندبوو و دەیانجووکاند٠ دایکە و بابە شاڵاویان دەبرد، دندووکی چووکیان لە گیانی مار رادەکێشا بەڵام مخابن کەلکی نەبوو ٠ مار زاری بە قەراهیلانەکە داپچڕی و دەیەویست جووجەڵەکان بە هێلانەوە هەڵلووشێ کە خوشکە چکۆڵەی چاو شینی من لە خە و راپەڕی٠

نیوە شەو بوو٠ ئەستێرەکان فوو کرا بوون٠ لە ئاسمان ، لە دیوارەکان ، تەنانەت لە پەنجەرە و رۆچنایی ، تاریکی دەتکا نێو ژوورەکەی ٠ یەك بە خۆی هاواری کرد٠ پرخەی خەڵك هاوارەکەی خنکاند و قووتی دا٠ هەناسەیەکی هەڵکێشا ، هەناسەکە پەنجەی لە سینگی دا کوتا و نەهاتەوە دەر ٠ دەستی بە ئەوکی گرت و رای کردە کۆڵان٠

هەر هەڵدەهات . کون تەواو نەدەبوو ، کۆڵان بنە بانی نەبوو ٠ وەرەز بوو ، ماندوو بوو٠ تاریکی بە شوێنیەوە نەمابوو ،لە جێی خۆی دانیشت٠ دیوارێك لە سووچی کۆڵان بەرز ببووەوە ٠ کوندێکی دەستە مۆ لە سەری هەڵنیشتبوو و سەری بێچوەکانی دەخوارد و پەنجەکانی فڕێ دەدان٠ دەستی بۆ پێی درێژ کرد ٠

پەنجەکانی تێکەڵاوی زەوی ببوون٠ ویستی هەستێ ، نەیتوانی٠ زەوی بۆ لای خۆی دەکێشا ،دەیەویست قووتی دا ٠

تاریکی لە پشت دیوار پەنگاوی خوارد بۆوە ٠ دڵۆپێك رەشاییتکا نێو دەریای مەندی تاریکی ، شەپۆلی داوە ٠ دەریا شڵەژا ، بوو بە فەرتەنە*٠ دیوار رووخا ٠ تاریکی بۆوە لافاو بە هاژە هاژ بە کۆڵانەکان داهاتە خوارێ و ماڵەکانی رەپاڵ نا ٠

خوشکە چکۆڵەی چاوشینی من زاری نەبوو هاوار بکا ، دەستی نەبوو مەلەی بکا ، پێی نەمابوو پێی رابکا ، چاوی بڕا تێرتێر گریا ٠ فرمێسکی شینبوو بە و دمێك* پەردەی تاریکی دادڕی٠ هەموو زەوی ، هەموو وڵات شین هەڵگەڕا بەڵام شینتر لە رەنگی ئاسمان ٠

کێوێکی بەرز لە بەر دەمی لە خەو دابوو ٠ ئارام ئارام لە سەر پەنجە وەسەر کەوت ٠ لە بن رەوەزێك هەتاو پەڵە هەورێکی بە خۆی دادابوو وخەونی دەدیت ٠ هەورەکەی لە سەر لادا و پیلی راکێشا ٠ هەتاو لاساری دەکرد و چاوی خەواڵووی هەڵنەدێنا ٠ خوشکە چکۆڵەم چاوی ماچ کرد ، قژی زەردی خۆی پێ دادا و بۆ نێرینەی ئاسمانی نارد٠

ئاسمان ساو بوو ، هەتاو قژی زەردی بڵاو کردبوو ٠ لە کێو داگەڕا ٠ ماڵەکان نەمابوون بەڵام دەرکەکان هەروا بە داخراوی مابوونەوە ٠ لە بەر هەر دەرکەیەکیش گوڵێك روابوو ٠ گوڵێك لە بەر خۆیەوە دەگریا ٠ گوڵێکی زۆر چکۆڵە بوو هێشتا نەپشکووتبوو ٠ لە بەر بێڵایە لانکەیەکی لێ بوو ٠ هەڵیگرت و لە لانکەی ناو لایە لایەی بۆ کرد بەڵام گوڵ هەر دەگریا و دایکی دەویست٠ هەستا رۆیشت پرچی بێنێ جۆ لانەیەکی بۆ دابەستێ٠ بۆ لای کێو رۆیشتەوە ٠ هەتاو زۆر دوور کەوتبۆوە و دەستی پێی رانەدەگەیشت ٠ هەرای لێکرد :

- هۆی هەتاوێ پرچە زەردەی من بدەوە !

هەتاو مۆنەی لێکرد و رووی لێ وەرگێڕا · خوشکە چکۆڵەم تووڕە بوو · دارێکی درێژی هێنا و لە هەتاوی راکێشا · هەتاو لە پڕ بوو بە مارێك ، رەش وئەستوور· لە دار هالا و هاتە خوارێ· مار گەزارەی* ئاورینی لێ دەرکێشا · داوێنی کراسەکەی ئاوری گرت· بە گریان بە کۆڵانەکان دا هەڵات · کۆڵان بنە بانی نەبوو · ئاور پەرە گر بوو و بلێسەی دەدا · گوڵەکان هەڵدەپرووزان و لە جێی خۆیان گلکۆیەکیان لێ ساز دەبوو · هەموو شار بوو بە گلکۆ ، شار بوو بە گلکۆی کۆلان · خوشکە چکۆڵەی چاو شینی من هەر دەتواوە و کەم دەبۆوە ·وردە،وردە هەر چاوی ما ، چاوێکی شین · چاوی شینی بوو بە کووژەکە· کووژەکەیەکی شین بەلام شینتر لە رەنگی ئاسمان ·

شەو نەبوو ، بەلام هەتاویش بە ئاسمانەوە نەبوو ·پیرێژنێك خەمی هەزار ساڵەی لە بوخچەی بن هەنگڵی نابوو و بە کۆمەکوم رێگای سەختی داهاتووی دەبڕی· لە سەر رێگا کووژەکەیەك کەوتبوو · دەستە چرچەکانی بۆ درێژ کرد· هەڵیگرت و لە سەر لەپی دەستی ماوەیەك تێی فکری · لانکەی نەوەکەی ساڵها بوو کووژەکەی نەبوو· روانیە ئاسمان کووژەکەی دەباغەڵ نا و دیسان ملی لە ریگا ناوە·

# پەنجەرە

**ماموستا سوارە ئیلخانی زادە**

■ دیاری : ئەحمەد شەریفی

تەوژم و تین ئەگەڕا
نوتفەدانی پەنجەرەکان
وە ···
ماڵی بێ زگ و زا*
پڕ ئەبوو
لە تۆوی بەهار !
شنە هەمیشە وەکوو
ویر دی زاری پەنجەرە بوو
ئەبوو بە سەر بەندێ
لە قاپی سەوزی زەمەندا*
دووپات ئەکراوە
منیش دڵم پشکووت
بەڵێنی دەعوەتی رەنگینی پەنجەرەی
تا کی بەرە و بەهارم دا
لە بەر بەیانی وەها
خۆشەویست و متفەڕکا
کە کۆلکە زێڕینە
ئەبوو بە مەقتەعی شێعری
د رێژی بارانە
وە ··· پڕ بە پێستی لەشم
حولۆلی گیانی
تەبیعەت بوو
دەستم
لە چەشنی شینکە لە خاکی
بەهاری پاك ئەڕوا
وە عەتری زاری کچی پێوە
خاکی ماجووەی*
منیش بە سەجع و هەوای
شەپۆلی چۆمە ئەلێم
شێعر و باو وبالۆرەم
وە بابە سەوزە بە نەرمی
خەریکە لاوژە ئەگێڕێ
بە شێعری پاراوم
وە ئیمانم
پتەو ئەبێ بە سەفای
گەورە ماڵی پەنجەرەکان
لە هەر چی ئینسانە
ئەگێڕمەوە بە هەموو بانگەوازی دەستی بڵاوم
دەمێکی بوو دڵی من
پڕ بە پێستی تەنیایی
شەپۆ و شینی ئەگێڕا
دەمێکی وادادێ
بە هەر چی والەوزە و زاری سەوزی پەنجەرەدا
دڵی بە تاسەی من
خەریکە پێ ئەکەنێ

ساڵی ١٣٤٧
سوارە

# ئاسنگەر و کوڕەکەی

**■ سمایل سەید شوکری**

لە رۆژگارانی زۆر قەدیم ، لە شارێکی بچووک ئاسنگەرێك دەژیا • ئاسنگەر پیاوێکی بەختەوەر بوو و بە ئا سوودەیی ژیانی رادەبوارد•

لە کاری ئاسنگەری ، داهاتێکی باشی هەبوو• تەنیا پەژارەی ئەوە بوو کە کوڕێکی تەمبەڵ و بێکارەی بوو کە دەستی لە رەش و سپی نەدەدا•

روژێك ئاسنگەر بە کوڕەکەی گوت :

- رۆڵە گیان تۆ ئێستا گەورە بووی و دەبێ کارێك بۆ خۆت بدۆزیەوە•دەبینی کە من پیر بووم و تۆش نابێ هەروا بێکار بسووڕێیەوە • جا بەو هۆیە سبەینێ کە لە ماڵ وەدەرکەوتی تا کارێك نەدۆزیەوە و هێندێ پووڵ نەهێنیەوەروو دە ماڵ نەکەیەوە.

کوڕەکە بەو باسە زۆر تێك چوو • رۆیی بۆ لای دایکی • کاتێك دایکی بەوەی زانی زۆری بۆ پەرۆش بوو• پێی گوت :

- خەفەت مە خۆ کوڕم من هێندێکت پووڵ دەدەمێ ،بیدە بە باوکت و بڵێ بۆ خۆم کارم کردووە و وەدەستم هێناوە •

کوڕە بۆ سبەینێ ئەو کارەی کرد• پووڵەکەی دا بە باوکی • باوکی کوڕە هێندێکی دەست رێ خست و دەنێو ئاوری کوورەی هاویشت و گوتی :

- ئەم پووڵە تۆ خۆت وە دەستت نەهێناوە •

کوڕە هیچی نەگوت •بە ناڕەحەتی بەرە و ماڵ بۆوە و چۆوە لای دایکی و رووداوەکەی بۆ گێڕاوە • دایکی سەبارەت بە خۆشەویستی کورەکەی ، لە رووی دڵسۆزیەوە ، دیسان هێندێکی دی پووڵ دا یە و پێی گوت :

سبەینێ زوو لە ماڵ وەدەرکەوە و تا شەو مەگەڕێوە • شەوێ بڕۆ لای باوکت و پووڵەکەی بدە یەو بڵێ خۆم کارم کردوە و

وەدە ستم هێناوە • لە وانەیە ئە مجار نەزانێ•

کوڕە بۆ سبەینێ ئەو کارەی کرد• بەڵام بابی دیسان زانی ئەوە دەسڕەنجی خۆی نیە •سەری راوە شاند و بە

پەرۆشی یەوە گوتی :

ـ ئەو پوولە بە کارنایە. ئەو پوولەت بە کار و تێکۆشانی خۆت وەدەست نەهێناوە . ئەگەر بێتوو سبەینێ وەشوێن کارێك نەکەوی ، شەوێ ناهێلم بێیەوە مالێ.

کوڕە زۆر نارەحەت تر لە جاران چۆوە لای دایکی و رووداوەکەی بۆ گێڕاوە . دایکی ئەمجار تێگەیشت کارێکی دروستی نەکردووە و باشتر ئەوەیە دلسۆزی بێ جێ بۆ کوڕەکەی نەکا . ماوەیەك بیری کردەوە و پێی گوت :

کوڕە زۆری پێ تێك چوو . بەلام ئیدی چونکە تازە کەس نەبوو دلسۆزی بۆ بکا ،بە هەناسە ساردی بە شوێن کارێکەوە لە مال وەدەرکەوت.

رووی لە چەند جێ کرد تا لە ئاکامدا لە لای وەستایەك کە بۆ کارگەرێك مەحتەل بوو ، دەستی بە کار کردن کرد. ئەو رۆژە زۆر ئازا و تەڕدەست کاری کرد . رۆژ ئاوا یە هەر چەند کە زۆرماندوو بوو ، بەلام دلخۆش بوو. خۆشحال بوو لە بەر ئەوەی کە دەیزانی ئەگەر ئەو پوولەی بە هێزی شان و با هۆی خۆی وەدەست هێناوە ، بۆ باوکی بەرێتەوە ، ئەو ئیتر ناتوانێ هیچی پێ بلێ و ئیرادی لێ بگرێ

ـ کورم باوکت راست دەلێ . واباشترە وە دوای کارێك کەوی و لە شان و باهۆی خۆت کەلك وەرگری و شتێك وەدەس بێنی. پوولێك کە بە کوێرە وەری و دەست و مستی خۆت وەدەستی بێنی ، بێتوو کەمیش بێ ، باشتر لەو پوولەیە کە بێ ماندوو بوون و بەخۆڕایی وەدەستت دەکەوێ .

کاتێ پووڵەکانم لێ دەئاور گەکە داویشتی، تۆ هیچ کاردانەوەیەکت لە خۆت نیشان نەدەدا ، چونکە بۆ وەدەس هێنانی ئەوان زەحمەتت نەکێشابوو تا بایخیان بۆدابنێی: بەڵام چونکە ئەمڕۆ ئەو پووڵەت بە

تێکوشان و کاری گران وەدەس هێناوە، قەدریشی دەزانی ٠ جا لە ئێستاوە من و دایکت نە تەنیا لەبوونی کوڕێکی وەك تۆ شەرمەندە نین ، بەڵکوو شانازیشت پێوە دەکەین ٠

کوڕە بە خۆشی بۆ لای باوکی چۆوە و پووڵەکەی دە دەستی نا ٠ ئاسنگەر دیسانیش پووڵەکەی لە ناو دەستی دا هەڵخلاند و دەنێو ئاوری کوورەی هاویشت و گوتی :

ـ نا ، تۆ دیسانیش درۆم لە گەڵ دەکەی ٠ ئەو دراوەت بە تێکۆشانی خۆت وەدەس نەهێناوە ٠ کوڕە لەم کارەی باوکی سەری سوڕ مابوو٠ خۆی بۆ لای کوورە هاویشت و پووڵەکەی لە ناو خۆڵە مێش و ئاگر دەرهێناوە و گوتی :

ـ دەڵێی چی بابە ؟ من لە بەیانی یەوە ئارەقە دەرێژم تا ئەم پووڵەم وەدەس هێناوە ٠ ئەو کاتە تۆوا بە هاسانی دەسڕەنجی من فڕێدەدەی٠

ئاسنگەر کە چاوی بەم کارەی کوڕەکەی کەوت پێکەنینی هات و گوتی :

ـ بژی کوڕم ، ئەو جار بۆم دەرکەوت کە ئەوە دەسڕەنجی خۆتە ٠ ڕۆژانی رابردوو،

□ ناوی کتێب :
جغرافیای غرب ایران یا کوههای ناشناخته اوستا
□ نویسنده : عماد الدین دولتشاهی
□ چاپ نخست : ۱۳۶۳
□ تیراژ : ۲۰۰۰ نسخه
□ چاپخانه‌ء نقش جهان
□ قیمت : ۳۷۰ ریال

ئەم کتێبە لە ۱۸۶ لاپەڕە دا بڵاو بۆتەوە ٠نووسەر (عماد الدین دولتشاهی ) دەڵێ کە ئەم کتێبە وەرگێڕاوی بەشێك لە " زامیادی یەشتە" کە یەکێکە لە کتێبەکانی ئەوێستا و دەپێشدا لە لایەن زانای فەرزانە ماموٚستاپوور داوودەوە کراوەتە فارسی٠

ماموٚستا دەوڵەتشاهی وەرگێڕانێکی تازەی لەم بەشەی " زامیادی یەشت " کردووە کە جیاوازی یەکی بنەڕەتی دەگەڵ وەرگێڕانەکەی پوور داوود هەیە٠ هوٚی ئەم جیاوازی یە دەوڵەتشاهی خوٚی بەیانی کردووە٠

" ئەغلەبی واژە ئەویستایی‌یەکان دەگەڵ ئەم واژانە کە لە کرماشان قسەی پێدەکەن یەکن و بە سانایی دەناسرێنەوە٠چەند ساڵێکی تەواو واژە ئەوێستایی و کوردی یەکانم لە بەرامبەر یەك راگرت و پێکم گرتن تا بوٚم روون بۆوە دەگەڵ زاراوەی کەلهوڕی و کرماشانی یەکن ٠ ئەوەشم بوٚ دەرکەوت کە زانا روٚژاوایی یەکان بێژ ( تلفظ) و مانای دروستی زوٚربەی واژە ئەوێستایی یەکانیان نەزانیوە و بە هەڵە وەریان گێڕاونە سەرفارسی٠ لە ئاکامدا هاتمە سەر ئەو بڕوایە کە بێ سەرنج دان بە وەرگێڕاوەکانی زانایانی روٚژاوایی ئەو کتێبە بە کەلك وەرگرتن لە زاراوەی کەلهوڕی و کرماشانی دووبارە وەرگێڕمەوە سەر فارسی ٠٠٠"

نووسەر بە تێراشکاوی و ئیمانەوە دەڵێ :
" بەشی زوٚری واژە ئەوێستایی یەکان دەزاراوە و بن زاراوەکوردی‌یەکانی روٚژاوای ئێران دا پاش هەزاران ساڵ هەر ماون کە یارمەتیمان دەدەن باشتر مانای واژە ئەوێستایی یەکان لێك بدەینەوە٠"

بوٚ نموونە رستەیەك لە ئەوێستا کە ماموٚستا دەوڵەتشاهی بەیارمەتی کوردی کەلهوڕی وکرماشانی مانای لێداوەتەوە رستەی ژێرەوەیە :
ئەوێستایی: [illegible]
بێژ بە پیتی کوردی : پەنامێ ئەو یەزدانەن تائەو زایات ٠

مانای بە کوردی : پەنام بوٚ ئەو یەزدانەیە کە ئەو توٚی زایاند (خوڵقاند)

دەوڵەتشاهی لە درێژەی کارە گرینگەکەی دا یەك یەکی ناوە ئەوێستایی یەکان لە بەر یەك هەڵدەوەشێنێ و لەت و کوتیان دەکا و بەرامبەرە کوردی یەکەیان لە بەرامبەر رادەگرێ و مانایان دەکاتەوە و تەرجمە و بوٚ چوونی ژاك دەموٚرگان و پووردوادوو زوٚر زانای دی وەلا دەنێ ٠ بەم شێوە ماموٚستا دەوڵەتشاهی ئاڵ و گوٚڕێکی گەورەی دەناسینی زبانی ئەوێستایی دا پێك هێناوە و خەتی هەڵەی بە سەر زوٚر بوٚ چوون و لێکدانەوەی پێشووی زانایانی ئێرانی و روٚژاوایی داهێناوە و ئەوە شتێکە کە لە داهاتوودا دەنگ و هەرایەکی زوٚر بەرز دەکاتەوە■

# شێعر چیه؟

ئەمیر حوسێنی

زۆرکەس لە زۆر جێگایان لە ئەدەبیات و شێعر و شاعیری دواون . بەڵام مەبەستی شایانی باس ئەوەیە کە :

ئێستاش بەشێکی زۆر لە شاعیرەلاوەکان نازانن لە شێعرەکانیاندا باسی چ بکەن! هەر لە سەر رێ و شوێنی پێشوو باسی زولف وئەگریجە و پرچی لوول و بەژن و باڵا و خەت و خاڵ دەکەن .

هەروەك دەزانین گۆران ئەو رچەیەی شکاند و باسی کۆمەڵایەتیشی ئاوێتەی شێعر کرد . بەڵام هێشتا هەن کەسانێك کە دەستیان لەم جۆرە باسانە هەڵنەگرتووە و دەڵێن :

ئێمە جگە لە باسی دڵداری خەمی دیکەمان نیە، بەڵام هەروەك دەزانین گەلەکەمان بە هەزاران دەردی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و رووحی هەیە کە شایانی باس و لێکۆڵینەوەن .

لە ژیانی ئەورۆدا کاتی باسی رەشماری پرچ وگۆنای ئاڵ بەسەرچووە .

ئەورۆ شێعری هەر شاعیرێك دەبێ گیروگرفتی کۆمەڵەکەی پێشاندا و هەر شێعرەش مەبەستێکی تێدا بەدی بکرێ کە سەرچاوەکەی کۆمەڵە .

" کاتێك شێعر وهۆنراوەی ئەدیبێك موتالا دەکەین خەم وپەژارەیەکی زۆر دامان دەگرێ و دڵ و دەروونمان رێك دەگوشرێ ، خەمێکی شاعیرانە کە بەردی بناغەی هونەرە بەڵام ئەو خەمە لە شێعری نوێدا بەدی ناکرێ . ئەوەش لە حالێکدایە کە خەم تەنگی پێ هەڵچنیوین و چواردەوری گرتووین . خەمی لاوبوون ، خەمی نان، خەمی داهاتوو، خەمی تەمەنێکی بەفیڕۆچوو ،خەمی ئاواتی بەئاکام نەگەیشتوو،خەمی ژن بوون ، خەمی بێکاری و تەنیایی و لە هەموان بەرزتو خەمی«بوون و نەبوون" .

شێعر دەبێ دەنگ و هاواری کۆمەڵ بێ .هێشتاش داب و نەریتی زۆر ناحەز لە نێو ئێمەدا باوە کە کەس بۆلاشیان نەچووە و تەنانەت ئاشێرەشی پێ نەکردوون .

" شاعیر دەبێ بە گوتنی هەر دێڕە شێعرێك موویەکی سپی کا و بە هەر هۆنراوەیەك سووچێکی گیانی بسووتێ ."

تایبەتمەندی یەکانی شاعیر زۆرن رەنگە ئەو دوو رستەی خوارەوە کە مێکمان شاعیر پێ بناسێنێ .

" شاعیری هاوچاخ دەبێ بزانێ لە چ سووچێکی ئەو دونیا پان و بەرینە دایە و چیان لێ ئەستاندووە .
ئەوانە دەبێ لە شێعرەکەیدا دەنگ داتەوە ."

شێعر و ئەدەبیات یانی دەنگی ژیان و گشت تایبەتمەندی یەکانی . جا ئەو تایبەتمەندی یانە چ دەرد بن و چ دەرمان .

ئەدەبیات یانی بەرەو رووبوونی ئینسان و ژیان .

# بێ کەس

سەلاح عەبدوللازادە

لە کۆڵانی ماڵە مامم دەنگ و هەرایەك دەهات · زیل و بەندێك بوو دەتگوت رۆژی قەرەوەیسە* · کەوشەکانم بەپەلە دەپێ کرد و بۆ لای هەراکە رۆیشتم · پیاوێکی پیر و ردێن سپیم دیت کە سواری ئەسپێکی بۆرە ببوو · دیار بوو چاوی کەم نوورە و منداڵێکی زۆری لێ کۆ ببۆوە یەك فیتووی لێدەدا و یەك شوولێ لە ئەسپەکەی راست دەکردەوە و هەر یەکە بە جۆرێك گاڵتەی پێ دەکرد · لێ یان کردبووە هەرا و ئەویش تووڕە ببوو و جنێوی دەدا و خۆی رادەپسکاند · زۆرم پێ ناخۆش بوو · پێم وابوو پیرە پیاو گێلە یا شێتە کە وا دەورە یان داوە و سەریان لێ شێواندووە · دەبێ چۆن بژی · بۆ کوێ دەچێ ؟ چارە- نووسی چیە ؟ هێدی هێدی چوومە بەرەوە و لێم پرسی

" مامە گیان بۆ کوێ دەچی ؟ ئەم مندالانە بۆلێت کۆبوونەوە ؟ · "

پیاوە پیرە لە قلپەی گریانی دا و کوتی :

-" برۆ لە من گەڕێ ! لێم گەڕێ با وام لێ بێ · حەقی خۆمە ! "

تێ نەگەیشتم دەبێ چی بەسەر هاتبێ و چی کردبێ ؟ منداڵەکانم بلاوە پێکرد* و جڵەوی بارگینەکەم گرت و کەوتمە پێشی و بردمەوە ماڵی خۆمان · پاش پشوودانێك لێم پرسی :

-" مامە گیان بڵێ بۆچی نارەحەتی ؟ "

لە وەڵامدا کوتی :

-" نارەحەتی چی ؟ بریا زوو مردبام و ئەو کارەساتەم نەدیبا !· "

لێم پرسی :

-" مامەگیان ، ماڵێك حاڵێك ، لە کوێ دەبی ؟ چۆن دەژی ، منداڵێك ، کوڕێك کچێك ، کەست هەیە ؟ "

هەر کە وام کوت کوورەی دەروونی بڵێسەی کێشا و زووخاوی هەڵڕشت · هەناسە- یەکی دڵسووتێنی هەڵکێشا و گوتی :

-" ماڵم هەبوو ، عەولادیشم هەبوو · بەڵام ئەمڕۆ کەسم نیە · سێ کوڕم هەن خودا غەزەبی خۆیان بەسەردا ببارێنێ و دنیای روونیان لێ تاریك بێ · بە هەزار کوێرەوەری وفەعلەیی و سەپانی و شوانی وگاوانی گەورەم کردوون ،پێم گەیاندن ژنم بۆ هێنان ، ئێستا هەرسێك لەسەر مووچە و مەزرای خۆیان و تێر و تەسەلن · رامناگرن، پێیان عەیبە بە من بڵێن بابە · خەڵك شیووکوڵم بۆ دەکەن · بووکەکانم رووم لێ وەردەگێڕن و بێزیان نایە کارم بۆ بکەن · دەڵێن لیکن و پیسە و لەرزۆك بووە و بۆگەنی دێ. لە ماڵدا هەرکات میوانێك، کەسێك دێ کوڕەکانم دەڵێن برۆ دەروم مەیە ژوور با نەزانن تۆ باوکمانی · ئێستاکەش دەریان کردووم و سێ رۆژە کوڕە گەورەکەم بە بیانووی دوکتۆر بەسواری تا ئێرەی هێناوم و خۆی لێ دزیوەتەوە !

ئەرێ کاکە گیان عەولادم پێ گەیاند بۆ ئەو رۆژە ئاوام بەسەر بێت یا بۆ ئەوەی داردەستی پیری و پەككەوتەییم بێ ؟

تێبینی:لە پڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلە دا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بە پێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (ٚ) دانەنراوە، واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی (شڕ ،کوڵ، زۆر ، شێر ، و ...) ی تێدابێ بە شکڵی ( شر ،کول، زور ،شیرو ...) دە نووسرێ ٠

ئەو عارفە دڵسووتاوە بۆ کچی گاور لە ئیسلام وەرگەرا ـ کلۆر ٢ ـ کز ـ دوو پیتی دوایی ئەلف بێتکە ـ سەر بەرەو ژوور ٣ ـ ڕێگا بە زبانی ترکی ـ نووسەرێکی بە ناو بانگی رووس ـ ردێن ٠ ٤ ـ دۆڵ و شیو ـ کاری " ریا " کردنە ـ بلوێر٠ ٥ ـ هیوا ـ ورگ ٦ ـ پادشای باڵندان ـ بەشێك لە خانووبەرە ـ سنەیی دەڵێ هەیە ٧ ـ لە وێرا ـ ئەو بارستا بەفرەی بە با دەکەوێتە سەریەك و کۆ دەبێتەوە " ئەو " بۆ نێرینە بە زبانی ئینگلیسی ٠ ٨ ـ ژمارە یەکە ـ ئاوەڵناوی پێوە ندی ـ وڵاتێکی ئەفریقایی ٩ ـ جێگای پێشوو ـ نێو چاوان ـ ١٠ ـ خوشکی مێرد ـ دووپاتەی پیتێك ـ ئاوەڵناوی دووهەم کەسی تاك و کۆ بە زبانی ئنگلیسی ـ هەوسار ١١ ـ تەشەر و تانە ـ چەقالە ١٢ ـ کاری شایستە و باش ـ ناوچەیەکی کوردستانی تورکیا ١٣ ـ بێدەنگ ـ نیوەی خودا حافیزی بە زبانی بێگانە ـ گیایەکی کوێستانی ـ فەرمانی هاتن ٠ ١٤ ـ نادیار ـ پیاو ـ مێژوو نووسی یوونانی قەدیم ١٥ ـ ڕژیمی خوێنمژی بەعس دەیەوێ بەم چەکە جووڵانەوەی کورد دابمرکێنێ ـ ئاوی نێو دەم ٠

١ ـ گوڵێکی بەهاری ـ " کن " بە زاراوەی بادینی ـ ئاوی زار ـ ٢ ـ نۆبەتی وتەب ـ ئاوارە ـ روخسار ٣ ـ ئامرازێکی کایە کردنی منداڵ کە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە ـ کەشتی بیابان ـ شە ٠ ٤ ـ واژەی هەڵبژاردن ـ دێوەزمە ـ ٥ ـ ئاوی ڕوونی سەر ماست ـ خەڵکی هەورامان ٦ ـ وردە بابەت ـ هەڵمەت ـ ٧ ـ دژی بڵیند ـ دووپاتەی پیتێك ـ زۆری نەماوە ببێتە " چۆم " ـ " ئێمە " بە زبانی بێگانە ٨ ـ خەڵکی عێراق ـ کورادە ٩ ـ دوو پاتەی پیتێك ـ بۆ سەر کەوتن دەبێ بەرز بی ـ ئاوا ـ دەردو بەلا ١٠ ـ ئەوانە دۆست نین ـ ئەستاندنەوەی لە دوژمن زۆر خۆشە ـ واژەی هەڵبژاردن ٠ ١١ ـ " نۆبە " بە زاراوەی سنەیی ـ پارچەیەکی ناسك و زەریفە بۆ دەسرۆکە و پشتوێنی ژنان ١٢ ـ ناوی مەلێکە ـ جواوی تێکەڵاو ـ دەستەمۆ ١٣ ـ ورتە ورتی هەست بزوێنی باڵندە ـ کایەیەکی بێگانە کە لە سەر میز دەکرێ ١٤ ـ باشوو ـ دەم و چاوی تەڕی پێ وشك دەکەنەوە ـ شێوە ڕۆیشتن ١٥ ـ لاواز ـ سوورەیەك لە قورئانی پیرۆز بۆ بەرێ کردنی پیاوی سەرە مەرگ ـ واژەی دەرد و کەسەر ـ ئاوی نێو دەم ٠

# پەندی پێشینیان

* دونیا دبیت بهوست ،بەلێ دوژمن نابیت دوست.
* دەستێ ماندوو ل سەر زکێ تێرە .
* دەستێ ب تنێ دەنگ ژێ ناهێت .
* دوێێ جەرباندێ چێترە ل ماستێ نەجەرباندی.
* دویرە نویرە.
* دەنگێ دەفێ دویرقە خوشە .
* دو کەر گارانەکن ، دو عەرەب کاروانەکن ، دو ژن دیوانەکن .
* دەرمانێ چیقێ هەر چیقە ، ل دوژمنی خونەکە هێڤی گەر تو شێربی دێ بی ریڤی.
* تەیرێ نێچیرێ ، دمێ وی یێ خارە .
* عاقل تاجێ زێرینە ، بەلێ سەرێ هەمیادا نینە .
* رویڤی یێ وارێ خوبەنە شێرێ خەلکێ بە .
* شام شەکرە،بەلێ وەلات شرین ـ ترە .
* **قسا راست یان ل شێتا ببهێ یان ل زارووا.**
* **قیزا کو دابیك پەسنێ وێ بدە بوخالو باشە .**

**محەمەد شەعبان شلی**

# مەتەل

١ ـ بنکێ ئاخینە ، ناڤکێ دارینە ، سەرکێ زێرینە .

٢ ـ حم حمە ـ دیوار سمە.

٣ ـ دارەکال دنێ ، پێنج تا دچنێ چهار ل روژێ ، یەك ل شەڤێ.

٤ ـ گیسکێ مەلا یی ، چو سەری چیایی ، نەهێلا داڤەکا گیایی.

٥ ـ کودکێ خوینێ ، چو جوخوینێ چو مزکەفتی ، پەلەك کەفتێ.

٦ ـ سێسەد ز ەلام هاتن برەنگەکی یێ سترانا دبێژن بدەنگەکی .

٧ ـ شەش بەند و بەند لکەك دو نان و کوتلکەك.

٨ ـ ل ناڤ دارو بارا ، زەر دکەن وەکی گوهارا .

٩ ـ سەرمشارە پێ خەپارە دووڤ قەتارە کەرو دیکە بێژە چیکە ؟

**بەرسڤا مەتەلان**
١ ـ میوا تری ٢ ـ مشك
٣ ـ نڤێژ ٤ ـ شە ٥ ـ تڤەنکد ٦ ـ مێشا هنگڤینی
٧ ـ تەرازوو ٨ ـ کوهیشك
٩ ـ دیك

* پیاو نابێ جحێلان بشکێنێ.
* پێم بلێ لە گەلّ کێ هەلّدەستی و دادەنیشی ؟ پێت دەلێم تو کێ ی ؟
* چون گوێمان لە دەنگی هەلّو دەبێ کە بە سەرماناتێ دەپەڕێ، هەرواش ناوی مروڤ دەمێنێ لە پاش مردنێ.

غەفووری

* قشقەلّە بە خوڕایی بن کلکی گامێش ناخورێنێ.
* بەزی بە پشیلەی بسپێری.
زورە ملی مل کەچی بەدواوەیە.
* سەد جاری بگرە و جارێکی ببڕە.
* وەستا خشتی خواردانێ ئاخری دەرووخێ .
* کەوچك بە دەستی کابان تەقەی نایە.
* لەو گوێ یە وەری دەگرێ لەوی دی دێداتە دەر .

**محەمەد رەسوولّبلێند گرامی**

* مەشهوورە هەرکەس بەکەم نەزانێ
پیاوەتی زوریش بەکەم دەزانێ
* بویە خاوەن کار هەر دەلێ زووکە
پێمەڕە دەست فەعلەوە سووکە
* گوێ بگرە پەندی هەموو کەس بیستوو
رامەپەڕێنە قەت سەگی نووستوو
* ئەو کارەی خوت پێت دەکرێ بە کەس مەکە .

( عومەر شێخ محەمەدی ) .

پیاوێك کوڕەکەی دە نیێرێتە دەرە وە تا فێری عەرەبی بێ کوڕە پاش سێ ساڵ دەگەڕێتەوە·
باوکی پێ ی دە لێ:
کوڕم شوکر عەرەبی باش ، فێربوویە؟
کوڕ : بەڵێ بابە گیان
باوك : عەرەب بە وشتر دە لێن چی ؟
کوڕ : بابە ئەوە زۆرگەورە یە
باوك : ئەدی بە مێروولە چ دەلێن ؟
کوڕ : بابە ئەوە زۆربچووکە ·
باب : ئەدی رۆڵە بە مە ڕ ی دەلێن چی ؟
کوڕ : وەڵڵاهی مەرم لە بیرنە ماوە بەلام شتێکی سەیریان بە بزن دەکوت ·

**"شنۆ فارووق سەیران"**

رۆژێك پیاوێك دەگاتە رێبوارێك ولێ ی دە پرسێ:
- کاکە سەعات چە ندە؟ رێبوار پتێکی لە سەری دەدا · پیاوەکە دەلێ :
- ئەوە چ بوو؟
- پێم وتی سەعات یەکە· کابرا لە ولامدا دەلێ :
- باش بوو سەعات دوازدە نە بوو

**" شنۆ : مەعسوومە ئەدیب "**

منداڵێك لەگەڵ باوکی لە بازاڕ دەگەڕێ · چاوی بە ئەفسەرێك دەکەوێ کە میداڵونیشانێکی زۆری بە سەرشان وسینگەوە دەبێ لە بابی دەپرسێ:
ئەو هەموومیداڵ ونیشانانە بۆچی بە سەرشان وپیلی ئەوپیاوەوەنە؟
باب :
ئەوانە نیشانی سەرکەوتن لە شەڕدان :
کوڕ :
ئەدی بۆ ئەتۆ ودایکم هێندە شەڕدەکەن بەلام هیچ نیشان و میداڵێکتان وەرنەگرتووە؟

**بانە: زاهیر رەزایی**

مامۆستا لە قوتابیان پرسیاردەکا :
پێغەمبەر لە کوێ وەفاتی کردووە ؟ هیچ کام لە قوتابیان نەیانزانی وەلام بدەنەوە·
لەوکاتەدا یەکێك لە قوتابیان ئاوالی تەنیشتی دە قورنجێ ئەویش بە هۆی ئێشی کە بە بەدەنی دەگا دەلێ :مەکە·
مامۆستا دەلێ بژی ·
داچەپلە یەکی بۆلێدەن ·

**پیرانشار : عەلی مەولوودی**

**کابرایەکی بێ عەقل لە شاری بە خەیاباندا دەڕۆیی ، لە پڕ چاوی بە پینەچی یەك کەوت کە سەتلێکی ئاوی سوور (کە وشی تێنابوو ودەری هێنا- بۆوە) لە پێش دانرابوو وەیزانی دۆشاوە ، چاوێکی لە سەتلە ئاوە سوورەکە کرد و بە پینەچی کوت :**
**-" خالە ئەو دۆشاوە لیوانی بەچەندە ؟**
**پینەچی سەری هەلێنا و تەماشایەکی کابرای کرد زانی زۆر بێ عەقلە کوتی :**
**-" بە پێنج قڕان·**
**کابرای بێ عەقل کە لیوانی چای پینەچی لەوێ بوو هەلی گرتوو لیوانێکی تێ هەلدا و خواردیەوە پاشان بە پینەچی گوت :**
**-" ها ئەوە پێنج قڕانەکەت بەلام دۆشاوەکەت بەکار نەدەهات نەلێی کابرا بێ عەقل بوو !؟**

**جەلیل یۆنسی**

# فەقییێ تەیران

وەرگێڕ لە ئینگلیزە ییەوە
ئەحمەد قازی

وەرگێڕ لە فارسی
پەرویز جهانی

## ب قەلەما:

## دوکتۆر مارگرێت روودێنکۆ 1

ناڤێ فەقییێ طەیران دەنگبێژی ئسترانێ مێرانییێ ، فیلسۆف و شاعر لناڤ گەلێ کورد دا ، ناڤەکی زۆر ناسکری و بناڤ و دەنگە ۰ کۆمەک زۆر ژ لاوژە و ئستران و شێعرێد ئەڤینداری یێ کو لئەدەبیاتا کوردی دا هەیە نسبەت ددەنە فەقییێ طەیران ۰

ئەو شێعر و ئستران و هۆزان و لاوژانە لبارا خو و، خەیسەت و رەفتارێ هەرباشە گەلێ کورد ، ئەڤینداریێ و دلداریێ دانە ، هندەک ژێ هۆزا- نێن فەلسەفینە ۰

بەرێ هەر تەنێ هۆزانێن ڤی شاعری بەرەڤ ببوون کو بەرەبەرە هندەک بابەتێن دی لێ زێدە بوون ۰ چیرۆک بێژ و دەنگبێژان کو بخو شێعر و ئسترانێد مێرانیێ و ئەڤینداری یێ دگۆتن هندەک شێعرێد وەکی شێعرێد فەقییێ طەیران لشوونەوارێ فەقی زێدەکرن ۰ هۆزانێن فەقی گەلەکی بینانی فۆلکلۆرێنە ۰ هۆزانڤان ل سەرەکانییێ هەرەبەرفرەیە فۆلکلۆرێ زۆر ویچ و بەهرە ڤەرگرتییە ۰

خەلک گەلەکی حەژی هۆزانڤانێ ئوها دکن ۰ ئەو جورە شاعرانە زوو دکەڤنە ناڤ چیرۆک و دەرەڤۆکا ۰ ئەڤ گۆتنا لبارا فەقییێ طەیراندا راست و دوروستە ۰ خەلکێ باوەر دکرن کو ئەو خودانێ هێزەک سرێ و خوداییە ۰ هەموو سەر وێ باوەرێ بوون کو ئەو زمانێ طەیر وطوو و چۆلەمەو هۆڤان و ئەزمانێ سروشتێ دزانە ۰ ناڤێ شاعر بخوژی هە ئەڤێ ئارش و مەعنییێ ددە ، (کەسێکو بال طەیرا هیم دبە ) ۰ کۆمەل و جڤاتەک زۆر حەژی شێعر و هۆزانێ فەقییێ طەیران دکن و هۆزانی فەقیژی لناڤ جڤاتێ دا زۆر پەڕڤەدایە و پێش کەتییە ۰ خەلک لهەر کۆم و دەستەیی دا حەژی هۆزانێ فەقی دکن ۰

پشکەک زۆر ل هوزانڤانێد هەڤچەرخ ل هوزانید خوەدا لشێعرێ فەقی نەمووشا هلددن و بینانی وی هۆزانا چێدکن و حەتتا گۆرەکی دەرڤۆک و ئەفسانا خوە دگەهینن وی ۰

ئاگاداری بێد مە لبارا ژیناڤی شاعری دا زۆر کێمە ۰ گۆرەکی نڤیسینێد (ئا ۰ د ۰ ژابا ) موحەمەد فەقییێ طەیران ( ۷۰۲ ـ ۷۷۷ کۆچی ) پێ ناسناڤێ ( میم و ح ) هۆزان ڤەهوونایە ۰ ئەو لبازارێ مکسێ سەر ب ئوستانا هەکاری لکوردستانا تورکیایێ دا هاتییە دونیایێ ۰ ژ شوونەوارێ وی مرۆڤ دشێ ناڤێ ڤانە بینە : " شێخی سەنعان " ، " چیرۆکا شێخ بەرسیسا " ، " چیرۆکا هەسپێ رەش " ۰

بێ گومان فەقییێ طەیران هەژمارەک زۆر هۆزانێ فەلسە- فی و ئەڤینداری یێ ڤەهوونایە کو بناڤێ شێعرێد فۆلکلۆریک جیدا مانە ۰ جدا کرن و هەڤ ڤەقەتاندنا کار وشوونەوارێ شاعر و فۆلکلۆرێ کارەکی زۆر چەتن و دژوارە ۰ بلی

شێعر و ئێسترانێد مه گۆتی
چیرۆکا " شێخێ سه نعانێ" ژی
کو ل ناڤ کوردانداا زۆر بناڤو
بانگه یا فه قییێ طه یرانه ۰

چیرۆکا ئه ڤینداری یا
شێخێ سه نعانێ ل سه ر کچا
گوندی ل ناڤ خه لکێ رۆژهه لاتا
ناڤین و وی ئالی قه فقازێ
بناڤ و بانگه ۰ په یدا کرنا
سه ره تا و ده ستپێکا جیهـ و
ده ما قه ومینا ڤێ سه رهاتێ
و دوورا چوونا ڤه گوڕین و
ته کووز بوونا وێ ل درێژایا
مێژوویێ دا کاره کی چه تن و
دژواره ۰ هه ر ته نێ مه رڤ
دکاره گومان بکه کو ئه ڤ
چیرۆکا ل جیهه کی دا
قه ومییه کو خه لکێ وێ ده رێ
فارسی ئاخفتنه ، چاغێ قه و-
مینا وێ ژی ده مه که کو
سۆفیتی و خودێ ناسی یێ
پێ دانایه سه ر مه یدانا -
بیرو هزرێد مرۆڤان ۰پێشترین
شۆلا ئه ده بی کو ل سه ر ڤێ
سه رهاتا ڤۆلکلۆریك هاتییه
کرن ، کارێ شاعرێ فارسی
بێژه ئیرانی شێخ فه ریده دین
عه طاره ( ١١٩٣ - ١١١٩ ) ۰پاشێ
ئه میر عه لیشیر نه وایی
( ١٥٠١ - ١٤٤١ ) پشتی وی ژی ل
سه ده یا نۆزدێ دا وه‌جده ت
گیلانی ، حوسێن جاوید ( ١٩٤١ ،
١٨٨٢ ) و هنده کی دی ئه و
سه رهاتا دانه به ر ڤه ژاندن
و ڤه هاندنێ ۰

ل کتێبا ( ئاخفتنا طه یرا )
" منطق الطير " یا عه طاردا
سه رهاتی یا شێخێ سه نعانی
و دۆتا گوندی ژی هاتییه
ڤه هوونان ۰ ل وێ کتێبێ دا
سه رهاتییا شیخ و کچکێ
بابه تا بنێشه ئیبه ۰ لێ ل
ره خ وێ سه رهاتێ دا هنده‌ك
بابه تێ دی ژی هاتییه ۰ لێ
هه ر ئوسا کو مه گۆت خیمێ
هه ره بنێشه ئیبه . ڤێ هۆزانێ
هه مان چیرۆکا شێخێ سه نعا-
نی و دۆتا گوندی یه ، کو
زۆرجارا وه کی شوونه وار و
سه رهاته ك جودا هاتییه
چاپ و به لاو کرنێ ۰

گۆره کی نڤیسینێ ئی ۰ ئی ۰
بێرتێلس ، ئه ڤه زۆر گرنگه و
به ربچاڤه ۰ ئه ڤ شوونه وارا نه
تنێ خودانێ ئه رزش وبابه‌ته‌ك
هه ره ژۆره هونورییه ، به لکو
خیم و بنێشا سۆفیتیێ ژی تێدا
جی بوویه ۰

ل شوونه وارێ نه وایی دا
ئه م دیسا بجوره کی بینانی
هه ڤ راستی ڤێ بابه تێ
دبن ۰ ل هۆزانا ئاخفتنا طه یرا
( منطق الطير ) دا سه رهاتا
شێخێ سه نعان خودانێ پله و
مه قامه کی به ربچاڤه ۰
نیوه رۆکا هه ردوو هۆزانا
بینانی هه ڤن ۰ چون نه وایی
نه خاستییه سه رهاتا ئاخفتنا
طه یرایه عه طار بگوهۆڕه ،
شوونه وارێ وی بناڤێ کاره کی
تۆره ڤانی یێ یه به ربچاڤ
نه هاتییه ناسین ۰ مرۆڤ
نه شێ کاری وی ڤه رگه ڕاند -
نه ك سه ڕاست ژ شوونه وارێ
عه طار بهه ژمێره ۰ نه وایی
ل شوونه وارێ خوه دا شرۆڤه
کرن و په سن و پسێد ا-
هه لگۆتنێن دوور و درێژ ئینایه
کو ل شوونه وارێ عه طاردا
به رچاڤا ناکه ڤه ۰ ئه وی
ده رکه تنا شێخ ل دینێ
ئیسلامێ ب ئاوو تاوه‌ك
تایبه ت و بره نگ و بێهنه‌ك
جودا راگه هاندییه و شرۆڤه-
کرییه ۰

ل فۆلکلۆرا کوردی دا چیرۆ-
کا شێخێ سه نعانی ب فه رقو
جودایی و گوهۆڕینێد زۆر
بناڤێ " دۆتا گورجا " هه یه ۰
قه ت دوور نینه کو فه قییێ
طه یران سه رهاته ك ژ وان
سه رهاتانا کر به خیم و
بنێشا هۆزانا خویه شێخێ
سه نعان ۰

ئه ڤ هنده هێژایی به را
خودانێ یه کو پاشی ڤه هوونانا
هۆزانا شێخێ سه نعانی ( یا
فه قییێ طه یران ) ئه ڤ
سه رهاته دیسا بینانی
هۆزانه ك فۆلکلۆری که تییه
ناڤ فۆلکلۆرێ کوردی و حه تا
رۆژا ئیرۆژی هه ر مایه ۰ده بییا
فه قییێ طه یران بۆ دانانا
هۆزانا خو سه رهاته ك بناڤو
بانگ بنێشه دانابه و پاشێ
ئه و سه رهاتا بێ کێم و کاس
هوونا ندبه ۰ ئه مما ئه ڤ گومانا
ژی پێ به رچاڤ گرتنا کێش و
قافیه یا رۆن و حه تا ئه و
په یڤ و گۆته یێ کو لێ
وێج ڤه گرتییه ( پشکا زۆر ه

په یڤا عه ره بینه ) راست ده رناکه ڤه ·

مه لێره دا هۆزانا فه قییێ طه یران و سه رهاتا فۆلکلۆری دایه به ر هه ڤ ·

**فۆلکلۆر :**

**رۆنایا فندێ گهشتێ**
**حوری یا بکوورا بهوشتێ**
**شێخ د ی سه ربانێ که نیشتێ**
**شێخ باطنی بانگ بکه تێ**
**شێخ خه ونێ دا دین د بوو**
**تژی دماخا خوون د بوو**
**سیڤا سپی ره نگین د بوو**
**ئاخ دووره رۆژا وێ بێ**
**ئه هلێ ته رز ئه هلێ ملووك**
**هندی مه زن چه ندی چووك**
**خوچه و ئاغا و ملووك**
**هه موو شێخ دکن پرسیار ێ**

**فه قییێ طه یران :**

**رۆهنیا فه ندێ گهشتێ**
**حوری یا بوکرا بهشتێ**
**د ی ل سه ربانێ کنشتێ**
**د ی کو که چبان دکه تێ**
**دنیڤا خه لوه تێ ئه و دین دبوو**
**تژی د ماخێ خوون د بوو**
**شه هبا سپی ره نگین د بوو**
**ئه وحال و ره نگ قه ت ژێ نه تێ**
**ئه هلێ طه ریق ئه هلێ سلووك**
**هه رچ مه زن ، هه رچ بچووك**
**ئاغا وخاجه و ملووك**
**پرسینه ل شێخ زه حمه تێ**

هه یلۆ ل به یته ك فۆلکلۆری یه ته زه دا کو کوردێد قه فقازێ ل سالا ١٩٦١ زدا چاپ کرنه ، مرۆڤ دشێ وه کی هه ڤ بوونا وێ دگه ل هۆزانا فه قییێ طه یران ببینه ·

فه رق و جودایا ڤان به یتانه هنده کی دگه ل به یتێ پێشین هه یه · ل بنێشی دا بابه ت و سه رهاتی هه یه که · ئه مما لێره دا ئه م دبینن کو شێخ ب داخازا سۆفی و موریدێد خوه ده ست ژ ئه ڤینا کچکا فله هه لناگره و نایێ سه ر دینێ ئیسلامێ ·

" ئه ز خوه خوه هه رم بێژم
شێخ عه طاره "
وه کی ئه و شه هه ر بۆ من
باغه و قیز بۆی من بوویه
هناره ! "

ئه ڤ به یته بینانی به یتێد پێشین نینه و ره نگێ وان ناده · خودانێ په خشانه ك رێك وپێك و ره هو په هێ هۆزانڤانی یێ یه · هۆزانێد وێ دگه ل به یتا به لاو بوویی دوروست بینانی هه ڤن وئه ڤه خوه ژی دگه ل هۆزانا فه قی وه کی یێکه ·

ل دانه به ر هه ڤا ره هو په هێ شێعری و په خشانی نه وه کی هه ڤ بوونا چاوانی و رێبازا شۆلێ و بکاربرنا په یڤ و گۆتنه یا ژی باش و رۆناهی به رچاڤا دکه ڤه · ئینانا په یڤێد سه رگرتی و کنایه و ئستعاره و گۆتێد عه ره بی نیشان ددن کو هۆزانڤان شاعره کی مه زن وخودان جه ره به بوویه · به یتا په خشانه ڤێ سه رهاتێ خودانێ تایبه تییه ك جودایه ·

ئه زمانێ به یتێ زۆر ساده یه و لایێ هونورڤانییا وان زۆر لاوازه · نیڤوه رۆکا وێ بجوره کی ساده هاتییه گۆتن و گه له کی نێزیکی ئه زمانێ ئاخفتنا خه لکێ یه و گۆتنه و په یڤێد عه ره بی تێدا به رچاڤا ناکه ڤن ·

ئیجا ئه ڤ پرسیارا تێته پێش کو گه لۆ شکلا په خشانا ڤێ به یتێ ژ شکلا هۆزانا وێ مێژڤه تره ؟ گه لۆ ئه ڤ به یتا په خشان بوویه ؟ خیم و بنێشا به یتا هۆزانێ یان به ره واژ ی وی یه ؟ به رسڤا ڤێ پرسیار ێ زۆر دژواره ·

" ئی · ئی · بێرتێلس " هۆزانا ئاخفتنا طه یرایاعطار بناڤێ خیم و بنێشا سۆفیتیێ دایه ناساندن ، کو ل وێ دا مرۆڤ دگێژه یێکاتی یا تنێ ·

هۆزانا شێخی سه نعانی ل ئه ده بیاتا فارسی دا کو گه له ك شاعرا ئه و ڤه هوونانه هه موو جیبیا ژێهه لچوونا مرۆڤێ خودێناس بۆ لایێ خودێ نیشان دده · ل ناڤ خه لکێد وی ئالی قه فقازێ دا سه رهاتا شێخێ سه نعانی ل بارا نیڤوه رۆك و چاوانییا خوه دا فه رق و جودایی دگه ل ئه و ا مه گۆتی هه یه · ڤێ ده رێ ئه ڤینا خودێناسی و مه عنه و ی جیهێ خو دده ئه ڤینا مادی و دلۆڤانییا مرۆڤانی یێ ·

دوومایی همیه

# پادشاهێ دادگەر

■ بێکەس مێرگەسۆری

هەبوو نەبوو کەس ژ خودێ گەورەتر نەبوو. پاتشاهەک هەبوو، پاتشاهەکی باش و خودێ ترس. هەروەختێ کو ڤی سوڵتانی نڤێژ دکر، مەکە و مەدینە دهاتنە پێش چاڤێ وی، رۆژەکی ژ رۆژان ل وەختێ نڤێژێ دا مەکە و مەدینە نەهاتنە پێش چاڤێ وی، چەند رۆژ پێ چوون سوڵتان رۆژ بۆ رۆژێ لاوازتر دبوو.

رۆژەکی دایکا وی گۆتێ:

- کوڕێ من چ هاتییە سەرێ تە بۆ من ژی بێژە کانێ تۆ بۆ رۆژ بۆ رۆژێ لاواز و لەغەر دبی.

سوڵتان گۆت:

- دایێ چ ژ دەستێ تە نایێ، ئەز چ تشتی بۆ تە نابێژم.

دایکێ گۆت:

- کوڕێ من مانە من شیرێ سپی دایە تە، ئەز زۆر حەز دکەم کو بۆ من بێژی.

سوڵتان ئاخینەک هەلکێشا و گۆت:

- دایێ ئەڤ چەند رۆژە کو ل وەختێ نڤێژێ دا مەکە و مەدینە نایێنە پێش چاڤێ من

دایکێ گۆت:

- کوڕێ من کا چ بێدادی و زولمەک ل مەملەکەتێ، فەقیر وهەژارەکی را هاتییە کرن، لەوا مەکە و مەدینە نایێنە پێش چاڤێ تە.

پاشا گۆتە وەزیرێ خۆ چار دەست جلکێد دەروێشا حازرکە. وەزیر چار دەست جلکێ دەروێشا حازر کر.

پاتشا دگەل وەزیرێ خۆ جلکێ دەروێشا ل خۆکرن و کەتن وەلات چوون حەتا گەهیشتن باژارێ بەغدایێ. چاڤێ وان ل کۆشکەک جوان و بلند کەت لێ دەروازێ وێ کۆشکێ سەرابن لێدابوون.. پاتشا ب وەزیرێد خۆڤە چوونە ناڤ حەوشا وێ کۆشکێ. گاڤا کو پاتشا و وەزیرێد خوڤە ب جلکێد دەروێشا چوونە ناڤ حەوشێ ژنەک ل قەسرێ هاتە خار، ژنەک هند جوان و جندی بوو کو وەکی وێ جندی ل دونیایێدا نەبوون.

ژنکێ دەروێش برنە ژوور و بۆ وان فراوین ئینا و گۆتە وان بفەرموون. پاتشا گۆتێ:

– خووشکێ ئەز نانێ وەناخۆم.

ژنکێ گۆت:

– بۆ دەروێشێ دەلال، چ کەس لڤێ مالێ بێ خارن و ڤەخارن نەچوویە، ما چ بوویە تو بۆ ناخۆی؟

پاتشا گۆتە ژنکێ حەتا تونەبێژی من کا ئەڤ دەرکێ کۆشکێ بۆچی وەرگەریایە و سەروبن بوویە ئەز نان ناخۆم.

ژنکێ گۆت:

– دەروێش بەلا خۆ ل مە ڤەکە، ئەز بێژم یان نەبێژم چ دەردەک ژ دەردێد مە دەرمان نابە، نانێ خۆ بخۆ و دەست ژمە بکێشە.

پاتشا گۆت:

– حەتا تو نەبێژی ئەز نان ناخۆم

ژنک نەچار ما و گۆت:

– رۆژەکی ئەز و خودامێد خۆ چووبوونە سەربانێ کۆشکێ و مە بەرا خو ددا دیمەن و بینبەرێد شار. هنگێ حاکمێ شارژی دەرکەتبوو سەیرانێ، وەختێ کو من دگەل خودا ما ل سەربانی دبینە دبە ئاشق و ئەڤینداری من. حاکم نهە میرێ من گرتییە و دبێژێ حەتا تو

ژنا خو بۆ من بەرنەدەی ئەز تە ئازاد ناکەم و ئەزێ تە بکوژم. ئەڤەیە مژی

دەرکێ کۆشکا خو سەروبن لێدایە و رەش گرتییە.

پاتشا دەماک ئەڤە بهیست فراوین

خار و پاشی فراوینێ پاتشا گوستیلا پاتشاهی یێ نیشانی ژنکێ دا و گۆتە

وێ هەرە بێژە حاکم من قەبوولە مێرێ من بەردن و ئازاد بکەن.

ژنکێ گۆت:

- نە ئەم ئیسلامن ئەڤ گۆتنە حەرامە و یا بوونی نینە.

پاتشا گۆت:

- بلا مێرێ تە بەردن هنگێ ئەز دزانم کا ئەز دێ چ بکەم.

ژنکێ قەبوول کر و بۆدەرێ دەرخا - نا حاکم رێ کەت و گۆتە دەرگەڤانا ئەز هاتمە بلا حاکم مێرێ من ئازاد بکە و ئەزێ گۆتنێ وی جی بینم.

حاکم دەستوور دا مێرێ وێ بەردان و ئازاد کرن و گۆتن سبەیی ئەم دێ، بێن و ژنکێ ببەن.

رۆژا پاشێ حاکم دگەل چەند ماقوول و گرەگرێد خو بۆ برنا ژنێ چوونە قەسرا وی مرۆڤی. بەرا خو دایێ چەند دەروێش ژی وا ل وێ دەرێ روونشتنە حاکم گۆتە وان هوون دەرکەڤن دەرێ، دەروێشا گۆت مەژی دڤێ ئەم داوەتا هنگۆ ببینن.

ل وێ دەمێ حاکم چاڤ ب پاتشای کەت و پاتشا گوستیلا پاتشاتی یێ نیشانی وی دا، چاڤێد حاکم ئالۆزیان و چۆکێد وی سست بوون و ل عەردێ کەت ونەهش بوو.

پاتشا حوکم کر دەست و پی یێ وان گرێ دان و ئەوانا هەموو ئیعدام کر و خودانێ کۆشکێ کرە حاکمێ بەغدایێ و دانا سەر جیهێ وی وگۆتێ:

- ئەگەر توژی ل سەر ریکا ئسلامی دەرکەڤی دێ ل ڤانە خرابتر بکەم.

هنگی پاتشا نڤێژ کر، مەکە و مەدینە ل جاران جوانتر هاتنە پێش چاڤێد وی و سوپاسی یا خودایی جی ئینا.

مـن دی سـەحـەر، شاهێ مەجەر، لەبسی دبەر، مـەخمـوور بـوو
ئەودێم زەری، سورموشتەری، یارەب پەری، یا حوور بوو

حووری وەشە، شیرین مەشە، کاکول رەشە، خال حەبەشە
خالێن دڤەر، مسکاتەتەر، نازك بەشەر، کافوور بوو

نازك لەتیف، گەردەن زەریف، لەبسێ شەریف، کیمخەوقەدیف
مـن دی بوەخت، ئەونیك بەخت، ئیرۆلتەخت فەغفوور بوو

فەغفوور سورە، سیمادورە، هەیبەت پورە، پور دل گورە
ئەوهاتەمەش، منچوونەهش، دل من دعێشقی فوور بوو

دل بووکەری، زایابەری، لازم هەری، دی ئەوزەری
مـن دی گەلەك، ئەو سورمەلەك، وەك مەشعەلەك، پرنوور بوو

مەی بەرکەفێ، مەشهاسەفێ، سۆزادەفێ، داقەرقەفێ
حوسنالدێم، وەسفان نەشێم، هەرچی دبێم ژێ دوور بوو

دامـن سرۆش، وەرمەی بنۆش، زەوق وخورۆش، لەوچۆم ژهۆش
ژوێ عێشوەیا، یاربووخوەیا، ئەونەژمەیا، ئەنگوور بوو

مـن دی بخاب، ئەوماهتاب، دادل کولاب، جۆهتێ غوراب
دل شەوشاند، خوێ لێ رەشاند، خۆش هەرشاند، تێك هوور بوو

هوورکر جەسەد، قەوسێن سەمەد، تیردان کەبەد، داد و مەدەد
جەرحان ژنەو، خوون دایەکەو عێشقا مەلەو، مەشهوور بوو

لەویەك نەسەق، مـن تێن سەبەق، نووروایەقەق دادل شەفەق
شیرین لەبێ، دێم کەوکەبێ، لێ بەندەبێ، دەستوور بوو

دلبەر نەزەر، دامن سەحەر، خەجلیم ژبەر، لێ ئەوقەدەر
زانم گوا، ئەومەهروا، وەك لوئلوا، مەنشوور بوو

## بسکێن رەش...

پاش فێرقەتێ، زۆرموحبەتێ، مژطەلغەتێ، چۆم حەزرەتێ
وەسلاجەبیب ،من بوونەسیب، مەلعوون رەقیب رەنجووربوو

*

جاما زەلال،خەمرا حەلال ، یاراشەپال ، دامن بحال
عێشقاغەدار، سۆهتی ستار، نیڤ ماویار، سەد سوور بوو

شاهی جەڤین، غەمژێ رەڤین ،مارێ شەڤین ،ئیساند ئەڤین
دەردوبەلا ، وێن چۆن هەلا ، عومرەك،مەلا، مەهجوور بوو

پورمن زەجر، دیتن هەجر، مابوو ئەجر، سوبح و فەجر
شەمعا مەهەل ،بوو سەد مەحەل ، میننەت مەدل،مەسروور بوو

یاروەعدەدا ، بلەعلێن خوەدا ، وەر بامەدا ، چین پەردەدا
دسپێدەیێ ، چووم وەعدەیێ ،کوژبادەیێ مەخموور بوو

ئێحرام مەبەست، ئەسوەد بقەست، یارهاتە مەست ،ئەزچوومەدەست
جۆهتێ حەبەش،تیردان بوەش، حەجامەخوەش مەبروور بوو

ڤێ کاکولێ، چینێن دەلێ، قەلبێ " مەلێ"داڤ دانە لێ
داڤا دلان، نیڤ سونبولان ، سەرسۆرگولان، مەنقوور بوو

* * * * * * * *

مندی ژغەفلەت جام دکەف شاهێ نەجەف دل کرهەدەف
رۆژهات شەرەف،*سێربوونەخەف، هەرچارطەرەف، نوورایەقەق

زولمەت نەما ،سوحبەت ڤەما ، نوورا شەمالان چوو سەما
لێ ئەودەما ، زولف بوون جەما ، هاتن سەمایێ یەك نەسەق

وەردان گولاڤ ،گرتن خوناڤ،لێ مندناڤ، سۆهتن هناڤ
مندی بچاڤ ،زولفێن بلاڤ،لێ بوونە داڤ ، بەندکر بناڤ

نوورا بەسەر، گوفت وخەبەر ، قەندوشەکەر، زولفان ل سەر
خالێن دقەر ،بایێ سەحەر، دابێتەدەر،سوبحا بحەق

# فەرهەنگۆک

**ئەوجە :** حەوجە ،حەوجێ، لازم ، پیویست
**ئەوەندووکە ( ئـــەوەندووسکە ) :** زۆرکـــەم نەختێك
**ئهوا :** ئەوها ( بن زاراوەی مەنگوڕی ) ئاوا ، وەها ، ئەوتۆ
**ئێرەیی :** بەغیلی ،چاوچنۆکی ،حەسوودی
**بلی :** بێجکە ، جگە
**بڵاو•پێکردن :** بڵاو کردنەوەی کۆمەڵێك کـــە لە جێگەیەك کۆ بوونەوە ٠
**بە دی :** ئاشکرا روون ، بەرچاو
**پاك :** هەموو ، تەواو
**پێ بە هەرزانی :** قەدەم بە خێر ، سەر بـــە رسـق
**پڕ پێدا کردن (گرتن ) :** بە پەلە دەباوە ش گرتن
**پێن وەگێڕن قەزایە :** بە قەزا پێمـــــــا ن بگێڕنەوە ٠ تۆڵەمـا ن لێ بکەنەوە
**پووت :** (پیت ) ، چەلەنگ ، حەڵەبی
**تنووك :** تاریك ، رەش و بێ رۆچن
**تێ فکرین :** بە سەرنجەوە چاوەکەسێك بڕین
**تاو ئەنگووت " :** رۆژ هەڵات ، تاو هەڵات
**ترازاندن :** لابردنلە سەر ، خستن
**تەڵاقن دەکەوێ :** تەڵاقمان دەکەوێ ٠ لـــــە ناوچەی مەنگور و شنۆ و دەشتە بێل و چەند ناوچەی دیکە دا ( ن ) لە جێکـــە ی ( مان ) دەکار دەکرێ ٠وەك کارن هەیە (کارمـــــا ن هەیـە ) ٠
**تلانەوە :** لە بەر چاو ون‌بوون٠ نوقم بوون ، خلـــۆر بوونەوەە
**توون :** جەهەنـدە م ،ئاوردان
**جە ڕدان :** پێچ دان . لێك هاڵاندن ، جیـــڕە-بابە دان
**جە لاب :** جەلاد ، سەر بڕ
**جووت غیرە ت :** غیرەتی جوولاوە ( ؟ )
**چرپان‌چرپان :** تێکە و لێکە ، ئـــاژاوە

**خـــاکی ماجوومی :** گلی رەشی بە قـەوەت و تەڕەزن
**خوەیا :** خوویا ، دیار
**خۆدە خێوی ( بن زاراوەی مەنگوڕی کۆن ) :** وەخۆ دێتەوە ، رادەپەڕێ
**دیارە و زەمزەمە :** داب و دەستوور ، کـەب-کەبە و دەبـدەبە
**دەستم دەگەڵ بدەنێ :** یارمەتیم بدەن
**دەبان :** باشـترین ، نەوعی خەنجەر
**دەمەر قوێپان :** جۆرە شەڕواڵێکە لە ســـــە ر دەرپێ وە لە پێ دەکرێ ٠
**رۆژی قەرەوەیس :** رۆژێکی پڕ هـــــــەرا و ئاژاوە
**رە داوا کەوتن :** وە دوو کەتن
**را -و بێ ڕا :** تەگبیر ، بەرژەوەند
**زەمەند :** شیناوەرد و جێگەی زەنوێـــر و پـــڕ گژ و گیا
**زەمورەك :** زەنبوورە
**زە برینگ :** زەبر ، زەربە
**زگەوزا :** زەو و زوو ( زاد و و لد )
**سوو لاندنەوە :** سووتاندنەوە ، زووراندنەوە٠
**سیـــر :** ئستیر ،ستەیرك ،ئستەیر ، سەیر
**شەپال :** جوان ،جندی ،رند، رێك و پێك
**شا ڵاو :** هێرش بردن ، بە پەلە بەرە وکەسێك یا شتێك چوون ٠
**غەنج :** نازو عیشوە
**غـــــولۆو :** تێك هاویشتن ، هەراوهەڵڵا
**فەرتەنە :** فرتەنە ، لانکە کردنی کەشتی و پاپۆڕ لە نێو ئاودا

**فا :** چەشنێك قوماش یا پارچە
**قەرحە (قرحە ) :** برین ، زان
**قلیاندار :** نۆکەرێکی تایبەتی کە قلیـان و سەبیلەی بۆ ئاغا ساز دەکرد ٠
**قاو کردن :** گاز کردن ، بانگ‌کردن
**قاوش :** (؟)

**کاردانەوە :** ( عکس العمل ، واکنش )
**کە سیـرە :** لە سەرمان سـڕ بوو ، بـــــە سەرما کەوتوو ٠
**کونە بڕ (کون‌بڕ ) :** پڕ بوون و پەستێوران
**کەڵ مـل :** ملهوڕ ، مل ئەستوور
**کریمان :** دامان‌نا ( فرضا ) ، وای دانێین
**کۆگجە :** هەڵووچە
**گفت :** بەلێنی ، قەول
**لە خواجا بێداریان‌دا :** لە شەیپیووریان‌دا (؟) ، خەبەریان‌دا
**مە سنەوی دە بێتـــە حـــە فتـــا مـــە ن :** وەر گێڕاوی ئەم نیوە شێعرە فارسی یە یـــە ( مثنوی هفتاد من کاغذ شود ) ٠
**مارتین :** نەوعێك تفەنگ
**ماك :** بنەما
**نەهیریە :** نەهریە ، نەهری ،(ناوچەیـــەك لە کوردستانی تورکیا )
**ودم :** هەناسەی شەفا هێنەر
**وانە :** دەرس
**وەردیان :** کێشکچی
**هێڵ :** خەت ، کووز
**هە رە مە :** پەلە

سروە خزمەتکاری ئەدەبی کوردی

